


# باشكوى شه رحى

# اللؤلؤ والمرجان

## فيما اتفق عليه الشيخان البخاري ومسلم

كه بريتييه له

١- كورته يه ك له ژيانى پيغه مبه ر (د.خ) و هه ندى له هاوه لان و زانايانى بوارى فه رمووده

٢- (كيف نتعامل مع السنة النبوية) به كوردى وه رگيرانى نورى فارس حه مه خان

٣- فه هره ستى كتيبى لوئلوئو مه رجان

(به رگى حه وته م)

# پاشكۆی شەرحی

# اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَان

# فِيما اتَّفَقَ عليه الشَّيْخَان البخاري ومسلم

كە بریتییە لە

١- كورتەیەك لەژیانی پێغەمبەر (د.خ)و هەندێ لەهاوەڵانو زانایانی بواری فەرمودە

٢- ﴿كيف نتعامل مع السنة النبوية﴾

بەكوردی

وەرگێڕانی نوری فارس حەمە خان

٣- فەهرەستی كتێبی لوئلوئو مەرجان

﴿بەرگی حەوتەم﴾



**********************************************

📖 ناوی كتێب: ( پاشكۆی شەرحی اللؤلؤ والمرجان فيما أتفق عليه الشيخان البخاري ومسلم ).

📖 نووسینی: مامۆستا نوری فارس حەمە خان.

📖 تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

📖 نرخی دەورەكە (١- ٧): ( ٦٥٠٠٠ ) هەزار دیناری عێراقیيە.

📖 ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانەكان ژمارەی سپاردن ( ١٢٧٨ )ی ساڵی ( ٢٠١٥ز)ی پێدراوە.

📖 كۆمپیوتەرو دیزاین: ( سامان محمد أمين ).

📖 لەسەر ئەركی كتێبخانەی ئارام لەسلێمانی چاپكراوە، مافی چاپكردنەوەی بۆ كتێبخانەی ناوبراوە.

---





بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿وُلِدَ الْهُدَى فَا الْكَائِنَاتُ ضِيَاءُ ** وَ فَمُ الزَّمانِ تَبَسُّمٌ وَ ثَنَاءُ﴾**

**سوپاس‌و ستایش بۆ خودای تاك‌و تەنیا، دروودی خوا لەسەر پێغەمبەری خودا، ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە یارانی‌و لە پەیڕەوانی، لەپاش سوپاس‌و ستایشی خوداو، ناردنی دروود بۆ گیانی پێغەمبەری زێدە خۆشەویست‌و نازدار، لەم بۆنە پیرۆزەدا عەرزم ئەمەیە لە خزمەتتاندا:**

**(یەکێ لەو شتانەی کەدەبن بەهۆی ڕۆشن بوونەوەی چاوو دڵ‌و دەروونی مرۆی موسوڵمان ئەوەیە کە موسوڵمان بەباشی حەزرەتی پێغەمبەری خودا بناسێ، ئاگایەکی باشی لە کورتەیەکی پوختی ژیانی پیرۆزی ئەو زاتە هەبێ، لە ڕۆژی لەدایکبوونیەوە هەتا کاتی وەفاتی، هەروا ئاگای لە چۆنێتیی‌و شێوەی شیرینی‌و ڕەنگ‌و ڕوخساری نازداری‌و نیشانەکانی جەستەی پیرۆزی هەبێ، وە ناوە جوانەکانیشی بزانێت).**

**حیکمەتی ئەمەش ئەوەیە: کە موسوڵمان خۆی ئامادە بکات بۆ شادبوون بە دیداری پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا هەرکاتێك بەخزمەتی گەیشت بەپێی ئەو زانیاریانەی کە لەلایەتی بیناسێتەوە، بەهرە لە دیدارەکەی وەربگرێ‌و داوای تکاو شەفاعەت‌و نزای باش‌و ڕێگە نیشاندانی لێ بکات، بەپێی شوێن‌و مەقامیش قەدرو ڕێزی لێ بگرێ‌و شایەتمان بەشانی بهێنێ (دروودی خودای لەسەر بێ). دەنا ئەگەر ئەم جۆرە شتە نەبێ، دەبێ حیکمەتی زانینی سیفەتی بەدەنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئێمە لەپاش مردنی چی سوودێکی تری هەبێ؟**

**بەپێی فەرموودەی ڕاست‌و دروست موسوڵمان لەزۆر کاتدا بەخزمەت حەزرەت دەگا، بەپێی فەرمودەی ساغ مرۆڤ لەخەوندا بەخزمەتی حەزرەت**

دەگا، لەناو گۆڕدا بەخزمەتی دەگا، لەزۆربەی مەڵبەندو مەشهەدەکانی قیامەتدا بەخزمەتی دەگا، بگرە لەهەندێکیانا هانای بۆ دەبا لە چورتەمو سەختەتی رزگاری بکا، شێخی موسلیم (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێت) دەگێڕێتەوە: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێت: (نامەوێ کە لەڕۆژی قیامەتدا بگەم بەکەسێکتان، ووشترێکی دزێتی، بە بۆڕە بۆڕ، بە قەڵاندۆشکانەوە بێت، بێ بۆلام بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریام کەوە گرفتاری دەستی ئەم ووشترە دزێتی‌یە بووم!).

دیارە کە شادبوون بە دیداری حەزرەت لەخەونەدا مایەی خێرو خۆشی هەردوو جیهانە، زۆرجار بووە بەمایەی هیدایەتو ئیسلام بوونی گەلێ لەوانەی لەخەونەدا بە خزمەتی گەیشتوون، لە فەرموودەی ساخدا هەیە: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێت: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ ، وَلاَ يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي/ رواه الشيخان». واتە: (هەرکەسێ لەخەونەدا من ببینێ، ئەوە لەوەدوا بەچاوی سەریش لەحاڵی هۆشیاریدا من دەبینێ، شەیتان قەت ناچێتە شکڵو شێوەی منەوە) هەروەها لە فەرمودەیەکی تری بوخاریدا دەفەرموێت: (هەرکەسێ لەخەویدا من ببینێ، ئەوە خەوێکی راستو دروستی دیوە، ئەو کەسەی کە لەو خەونەدا دیویەتی من بووم، چونکە شەیتان خۆی بۆ ناکرێت بەمنو ناتوانێت بچێتە شێوەی منەوەو ئەوسا خۆی پیشانی خەڵك بدات لەخەوو شتی وادا) کەواتە دیتنی پێغەمبەری خۆشەویستو ئازیزو نازدار بەخەو، خەڵاتو بەهرەیەکی گەلێ گەورەیە، نیشانەی ئەوەیە کە ئەو موسوڵمانە لەسەر ئیمانو ئیسلامەتیو باوەڕی ساغ دەمرێو، ئاخر خێر دەبێو حوسنی خاتیمەی بە نسیب دەبێ، خودا بە رەحمەتی خۆی بە نەسیبمان بفەرموێ، گەرچی موسوڵمان بەوە نابێ بە سەحابە، بەڵام شادبوون بەدیداری




خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەوندا دادەنرێت بە پەیوەندییەکی گیانی، بە ئیتیسالێکی رۆحی گەورە، خوا یاربێ دەبێ بەسەرەتاو دەرگا بۆ گەیشتن بە پلەی ویلایەتی شەرعی. (بڕوانە: شەرحی صحیحی موسلیم/ نووی جـ ١٥ – ص٢٤).

ئیمامی بوخاری (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێت: (ئیبنو سیرین کە زانایەکی گەورەی خەو پەرژێنزانە)، فەرموویەتی: (ئەمە کاتێ وایە کە خەو بینەکە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەوندا لەسەر شێوەی راستەقینەی خۆی لەخەوندا ببینێ). (بڕوانە: عینی ١٤٠/٢٤).

زۆربەی زانا گەورەکان ئەم تەعلیقەی بوخاری دەکەن بە سەرمەشق و دەفەرموون: (بەمەرجێ دیتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەوندا دادەنرێ بەڕاست، کە شکڵ و شێوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو خەونەدا نزیك بێ لەشکڵ و شێوەی کاتی ژیانی، وەك لە سوننەت و سیرەتی ساخدا روون کراوەتەوە، یان لەسەر هەمان شێوە بێ بەتەواوی، دەنا وەك ئەوە نییە کە لەسەر شێوەی راستەقینەی خۆی بیبینی). کەواتە زانینی شکڵ و شێوەی راستەقینەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەبێ بەهۆی ناسینەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخەوندا، وە دەبێ بە بەڵگەیەکی روونی ئاشکرا، بەپێی حەدیسی صەحیح، کە ئەو کەسە لەخەوندا بەبێ شك و گومان بەخزمەت حەزرەت گەیشتووە، دەی چی بەهرەیێ لە جیهانا لەوە گەورەترە، جا لەسەر ئەم بنیاتە ئەگەر کەسێ سەد ساڵ خۆی پێوە خەریك بکا هێشتا هەر کەمە.

ناسینەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو گۆڕدا دەبێ بە کلیلی رزگاری ئێجگاری، لە فەرمودەیەکی بوخاری و موسلیمدا خۆشەویست

(دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێت: (بەنـدە کاتـێ دای دەنـێن لـەناو گۆڕەکەیـداو هاوڕێکـانی بـەرەودوا دەگەڕێنـەوە، هێـشتا گـوێی لـە چـرپەی کەوشەکانیانە: کـە دوو فریـشتە دەگەنـە سـەری، ناویـان (نکیر) و (منکـر)ە دای دەنیشێنن‌و پێی دەڵێن:

بـاوەڕت چـی‌یـە لـە بـارەی ئـەم پیـاوەوە، واتـە: پێـی دەڵـێن: بیروبـاوەڕت چی‌یە دەربارەی ئەم پیـاوە: کـە نـاوی موحەممـەدە؟ جا ئـەوەی: کـە موسـوڵمان بێت بە باشی دەی ناسێتەوەو لە وەڵامدا دەڵێ: ئاگادارم: کـە ئـەم پیـاوە بەنـدەو پێغەمبەری خودایە!) لە دەقی فەرموودەکەدا: کە بە عەرەبی‌یە، پێی دەڵێن: «مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَـذَا الرَّجُـلِ» جەنابی مەولـەوی خۆمـان (رەزاو رەحمـەتی خـوای گەورەو سەروەری لێ بێت) ئاوا لەسەر ئەم شێوەیە شـەرح‌و راڤـەی ئـەم رشـتەیە دەکات‌و دەفەرموێت:

بـۆ (هــذا) مەحـسوس موشـاهەد تــەوێ

دەشـــێ پێغەمبـــەر حـــازر بـــێ لـــەوێ!

مامۆستا مەلا (عبدالكريم)ی بیارەش (ڕەحمەتی خوای گـەورەی لێ بێـت) ئـاوا راڤـەی ئـەم هـۆنراوەی مەولـەوی دەکـات‌و دەفـەرموێت: بەبۆنـەی وشـەی (هذا)وە: کە لـە پرسـیاری فریـشتەکاندا ڕیوایـەت کـراوە، مەولـەوی دەفـەرموێت (هـذا) بـۆ ئیـشارە بـۆ کـراوی مەحـسووس بـەکار دەهێنـرێ، وادیـارە حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو قەبرەدا (حاضر) دەبێت!

ئەمـــەی نووســـیمان قـــسەی کتێبـــە

کتێبـــی حـــل بـــووش قـــسەی حلێبـــە

رازی خـــــــــودایی ئەوەنـــــــــدە زۆرە

لـــە ژمـــارە نایـــێ، بـــە ملیـــار جـــۆرە



مەر لە ژێر خاکا پەیی پێ بەرین

ئێمە تا نەمرین زۆر بێ خەبەرین

پێش ئەوەی لووتت لە بەردی ئەلحەد

بدا، قەبووڵ کە دینی موحەممەد

دەنا کاتێکت زانی کار لە کار

تەرازاو بویتە گۆری گۆڕی تار

حوببی موحەممەد خۆیو کەسوکار

بکە بە مایەی ڕەزای کردگار

بەدنمەکییە بۆ ئێمەی ئوممەت

قسەی خێر نەکەین بۆ کەسی حەزرەت

دروودو سەلام لەخۆیو خزمی

هەر لە بەرزی بن نەکەونە نزمی

ئەی لە نووری خوا دروست کراو تۆ!

ئەی لە گوڵ جوانتر شێوەو ڕەنگو بۆ!

لەبەر بێ کەسی لێم هەڵسا بۆسۆ

گشت لێم تۆراون، قوربان ئەتۆ بۆ!

بە ڕۆحو بە دڵ تامەزرۆم لەبۆ

بۆنی ئەو بایەی دێنێ بۆنی تۆ!

چوار توخمەی لەشمو پێنج هەستم هەرنۆ

بەو بایە دەژین کە دێ لەلای تۆ!

تۆ بۆی بۆ گشت لادەچێتو دەڕۆی



بـــۆ شـــادی ژینمـــان مـــانگی نـــوێی ئاســـۆی
لەبـــــەر خـــــاتری کـــــەس‌وکاری تـــــۆی
بـــۆ جـــەژنم ببـــە بـــە مـــانگی نـــۆ بـــۆی
بـــەڵکو لـــە ســـایەی خـــودای فـــەرمانڕەوا
ڕۆژی ڕووت هـــەڵبێ لـــە گـــۆڕی تارمـــان
نـــووری کۆتـــایی ژینـــی پـــڕ لـــە ژان
بکـــا بـــە شـــایی جـــەژنی ڕەمـــەزان

جـاوا ئێمـەیش لـەم ڕوانگـەو گۆشـە نیگایـەوە، پوختـەیێ لـە ژیـان‌و ناونیـشان‌و ڕەفتـاری شـیرینی حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـەیان دەکـەین، خـوا یاربێـت هـەتا سەرچـاوەی ڕاسـت‌و دروسـت دەسـت بـدا بـەلای سەرچـاوەی لاوازو بـێ هێـزدا ناچـین، بـە ئومێـدی ئـەوەی: کـە ببێـت بـەهۆی تـەحبیب‌و خۆشەویـستی زیـاتر بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دڵنیاشـین لـەوە: کـە هەرچـی ببێـت بـە مایـەی خۆشەویـست بـوونی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەبەرچـاوی موسـوڵمانان کـارێکی زۆر پەسـەندو نایابە، جاوا بە پشتی خودا دەست بە مەبەست دەکەین‌و دەڵێین:

**یەکەم: پاکی‌و خاوێنی خانەدانەیی ڕەســەنی پــیرۆزی پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ)**: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەم بارەیەوە، بۆ (تحدث) بە نیعمەتی خودا، دەفـەرموێ: (چـەرخ بـە چـەرخ‌و پـشت بـە پـشت بـە پـاکی‌و پـیرۆزی لـە پـشتی بـاوک‌و دایکـی پـاک دامـەن‌و پـاکیزە هاتوومەتە خوارەوەو، باوک‌و دایک‌و نەنک‌و باپیرەکانم لەهـەموو سـەردەمێکا لـە باشترین چینی ئادەمیزادی ئەو سەردەمە بوون، لـە پـشتی بـاوە ئادەمـەوە ئەمـە

حاڵم بووە، هەتا گەیشتوومەتە ئەم سەردەمەی خۆم: کە خوا ڕەوانەی کردووم‌و کردوومی بە پێغەمبەر) (بوخاری ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە).

**دووەم**: **لە دایك بوونی پێغەمبەرو ناوە جوانەکانی‌و سەرجەلەی پیرۆزی‌و زێدی پیرۆزی‌و جێگەی گۆڕی نازداری**: زاناکان (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموون: (یەکەم پێویست لەسەر دایك‌و باوك، کە فێری منالی فامیدەی خۆیانی بکەن ئەمەیە: الله خودای ئێمەیە، موحەممەد پێغەمبەرمانە، لە مەککە لە دایك بووە، هەر لە مەککە خودا کردوویەتی بە پێغەمبەرو پەیامی ئیسلامی پیادا نارد، لە مەدینەی نازدار وەفاتی کردووەو، گۆڕی پیرۆزی وا لەوێ لە مەدینە).

پێشەوا بوخاری (ڕەزای خودای لێ بێ) سەرجەلەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە درێژی دەگێڕێتەوە، ئەمە سەرەتاکەیەتی: (موحەممەد کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی (عبدالمطلب)، کوڕی هاشم) دایکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی ئامینەی کچی وەهەبە، دایك‌و باوکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە هۆزی قوڕیشن، لە باپیرەی شەشەمدا: کە ناوی کیلابە، ڕەچەڵەکیان یەك دەگرێتەوە، کەواتە: حەزرەت بە نەتەوە عەرەبە، لە نەوەی ئیسماعیلی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمە (دروودی خودایان لەسەر بێت) قەیسی کوڕی مەخرەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (من‌و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ساڵی عامولفیلدا لە دایك بووین).

لە حەدیسێکی زەعیفیشدا هەیە دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «ولدت في زمن الملك العادل أنوشيروان» گەرچی ئەم حەدیسە زۆر لاوازو بێ هێزە، بەڵام گومان لەوەدا نییە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ماوەی موڵك‌و پادشایەتی ئەودا لە دایك بووە، ڕێکەوتی وایش




نوخـشەی باشـەو نوقلاّنـەی خێـرەو، بـۆ ئەنەوشـیرەوان شـانازییەکی گەورەیـە هەروا بۆ ئێران و خەڵکانی ئێرانیش. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـە ڕۆژی دوو شـەممەدا، لـە شـەوی دوازدەی مـانگی مـەلوددا: کـە بـە عـەرەبی پێـی دەڵێن: ڕەبیعول ئەووەل لەساڵی عامولفیلدا، بە چل ڕۆژ لەدوا واقیعەی فیل، لە سـاڵی (٥٧٠)ی زایینـیدا، لەسـەردەمی پاشـای ئەنەوشـیرەوانی دادپـەروەردا، لـە مەککە لە دایك بووە.

لـە فەرموودەیـەکی شـەیخەیندا حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هەندێ لە ناوە پیرۆزەکانی خۆیمان بۆ نیـشانە دەکـات و، وەجهـە تـەسمیەیـەشـیان بـاس دەکـاو دەفـەرمووێ: مـن نـاوم موحەممـەدە، مـن نـاوم ئەحمـەدە، مـن نـاوم (مـاحی)یـە، واتـە: قەلاچـۆکەری کـوفرو فـرە خـواییو بـێ بـاوەڕی، مـن نـاوم (حاشرە) واتە: لە ڕۆژی حەشردا پێشڕەوی سەرجەم خەڵکی دەکەم.

لە گێڕانەوەیەکی شێخی موسلیمدا (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (وە ناوم پێغەمبەری تەوبەیـە، وە نـاوم پێغەمبەری ڕەحمەتە).

نـاوە هـەرە ناودارەکـانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) (موحەممـەد، ئەحمـەد، تاهـا، یاسـین، حاشـر، عاقـب، پێغەمبـەری تەوبـە، پێغەمبـەری ڕەحمـەت، موقـەففی) عاقـب واتـە: پاشـەبەرە، مەبەسـت دوا پێغەمبـەرە، موقـەففی واتـە: پـەیڕەو، مەبەست ئەوەیـە: کـە هـەر پێغەمبـەرو ئومەتی بە ڕاستی پەیڕەوانی پێغەمبەرە پێشینەکانن، هەرکەسێکی تـر لەمـەولا لافی شتی وا لێ بدا ڕاست ناکا، وەکـی تـریش دیـارو ئاشکرایە: کـە زۆریـی نـاو، بەڵگـەی پایـە بـەرزی خـاوەن نـاوە، دەڵێن: لـە کـاتی لـە دایکبـوونی حەزرەتـدا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) گـەلێ ڕوداوی سـەیر سـەیر، بـە بۆنـەی لـە دایـك

بوونیەوە ڕووی داوە، لە قەسیدەی بوردیەدا باسی هەندێکیان دەکا، ئەوەی: کە گومانم تێدا نییە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە هەموو کاتێکی ژیانیدا جێگەی چاودێری تایبەتی خوای گەورە بووە، وە زۆربەی ژیانی پڕ بووە لە موعجیزات‌و ئیرهاسات، لە سەرەتای لە دایك بوونیەوە هەتا کاتی وەفاتی، خەواریق‌و موعجیزاتی لێ بینراوەو لە سوننەتی ساخدا تۆمار کراوە، وەکی تریش بەپێی دەقی ڕۆشنی قورئان لە دایك بوونی موساوو عیساوو یەحیا سەرئاساو موعجیزە ئامێزبوون، دەی دەبێت پێغەمبەری خۆمان چی لەوان کەمتر بێت، هەتا ئەوەی بۆ ئەوان دروست بێت، بۆ ئەو دروست نەبێ؟!

**سێیەم: نیشانەی جەستەی پیرۆزی (دروودی خودای لەسەر بێ):**

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا بڵێی شێوەی شیرین بوو، قەڵەمێکی ڕێکی هەبوو، لەش‌ولارێکی ناسك‌و نازداری هەبوو، چەندە بڵێی جوان بوو، چونکە جوانیی ڕواڵەت‌و شیرینی دیمەن‌و ناسك‌و نازداری ڕەنگ‌و ڕوو، هاوتا لەگەڵ ڕەفتاری بەرزو کرداری باشدا، نیشانەی پاك‌و خاوێنی دڵ‌و دەروونە.

**ڕەنگی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ)**

سوورو سپییەکی نازدار بوو، بوخاری (ڕەزای خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە: ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) زۆر جاران ئەم شیعرەی ئەبو تالیبی دەخوێندەوە: کە لە مەدح‌و ستایش‌و وەسفی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ:

وأبـــيض يستـــسقى الغمـــام بوجـــه

ثمـــال اليتـــامى عـــصمة الأرامـــل

واتە:

سپیکارێکە هەور بە روخساری دەبارێنێ باران

ئەوە پشتو پەنای هەتیوانو دالدەی بێوەکان

حەسسانی کوڕی سابتیش (رەزای خودای لێ بێ) لە وەسفی شێوە شیرینی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ:

وأحــــسن منــــك لم تــــرقط عــــيني

وأجمــــل منــــك لم تلــــد النــــساء

خلقــــت ت بــــرءا مــــن كــــل عيــــب

كأنــــك خلقــــت كمــــا تــــشاء

واتە:

بەچـاو نـەم دیـوە وەك تـۆ شـۆخو شـەنگ

لـەدایك نـەبووە رۆڵـەی وا خـۆش رەنـگ

دروســتكراوی بــێ گــەردو بــێ نــەنگ

چــۆنت دەوێ وا نــازدارو قەشــەنگ

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) رواڵەتێکی جوانی نوورانی هەبوو نیشانەی دڵو دەروونی پاكو خاوێن بوو باڵای ناوەندی بوو، نە زۆر درێژ بوو نە زۆر کورت بوو، بەڵکوو بە ئاستەم کەڵەگەت دەینواند ناوقەدی باریك بوو، لەشی قەبە نەبوو، بەڵام لەڕولاوازیش نەبوو، واتە: قەدو باڵای ڕێكوپێك بوو، سەروکەللەی قەوی بوو، سەر جومگەکانی ئەستوور بوون، ناوچەوانی پانو جوانو نوورانی بوو، هەردوو لاجانگەکانی پان بوون، برۆی باریكو کەوانیو درێژکۆڵەو پڕ بوون، لە دوورەوە برۆکانی وەك تێك راژاو وابوون، لە نزیکەوە: کە سەرنجیانت دەدا پەیوەست نەبوون، برژانگی درێژو پڕو جوان بوو، چاوەکانی قەویو نەخشینو ئەکحەل بوون، ئەکحەل واتە: چاوڕەشی بێ

سوورمە: کە هەر لە خواییەوە رەش بێ، رەشێنەی چاوەکانی گەورەو رەش بوون، سپێنەی چاوی خاڵخاڵی سووری تیابوو، لووتی کەمێ درێژ بوو، ناوەڕاستی لووتی کەمێ کوڕ بوو، سەری لووتی کەمێ باریك بوو، دەمی گەورە بوو، گەورەیی دەم لەناو عەرەباندا پەسەندە، چونکە نیشانەی رەوانبیژییە، ددانی ورد بوون وەك سەدەف بریقەدارو ئاودار بوون، کەمێك ددانەکانی بلاوبوون، بەلام شاش نەبوون، لە کاتی قسەکردنندا قوببە قوببە نوور لە زاری دەباری! ددانە پێشینەکانی لەو کاتەدا وەگ گلۆپ شەوقی دەدایەوە! سەر کولمەکانی ساف بوون، دەمو چاوی گووپن نەبوو، روومەتی پان بوو، ئەمە تەختی روومەتی بوو، ناوشانو سنگی گەورەو پان بوو.

لە فەرموودەیەکی درێژدا: کە پێشەوا ترمزی (رەزای خودای لێ بێ) بە رشتەیەکی ساغ دەیگێڕێتەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (جا چاوم لێ بوو خودا دەستی دانا لەسەر ناوشانم، ئیتر فێنکایی سەر پەنجەکانی گەیشت بەناو هەناوەو دڵم پڕ بوو لە زانستو هەموو شتێکم بۆ روون بووەوەو شت نەما: کە نەیزانم، ئیتر زانیم کەچی لەنێوانی رۆژهەلاتو رۆژئاوادا هەیە) (تاج – ١ – ٢٧٣ ).

لە داستانی شەق کردنی سنگی پێغەمبەریشدا (درودی خودای لەسەر بێ) ئاماژە بۆ پڕبوونی سنگی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە ئیمانو زانستو حیکمەت هەیە، هەروا لە داستانی ئیسراو میعراجدا شتی وا هەیە.

کەواتە:

لە پەرەی دڵت لە جێگەی دەفتەر
بنووسە بڵێ: الله أکبر
وەك (لوح المحفوظ) نەخشەی بوونەوەر

نووســـرا لـــه لـــهوحى ســـينگى پێغەمبـــەر
پەنجـەى وەك قەڵـەم، سـينگى چـون دەفتـەر
نووســـى لـــە دووتـــوێى زانـــست سەراســـەر
مـــەڵێ چـــۆن چـــۆ نـــى جێـــى دەبێتـــەوە
ڕەخنـــــەى وا بخـــــە ژێـــــرى پێتـــــەوە
"گـــــەر زەڕڕە شـــعور وەهـــا پێتـــــەوە"
كـــــە ووتـــــت خـــــودا دەبڕێتـــــەوە
بەقـــــەد نيـــسكێكە ديـــسكى كۆمپيتـــەر
بەقـــــەد ســـــەد مـــــەلا عيلمـــــى والەبـــەر

حـەزرەت (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) دەسـتو پـێى قـەوى بـوون، نـاو لەپەكانى پان بوون، دەستى نەرمو شل بوو، پەنجەى قەڵەمى بـوو، پاژنـەى پـێى كەم گۆشت بوو، هەردوو لاقى كەمێك باريك بوون، گەردنى وەك پارچەى بلـوور سافو بێگەرد بوو، دەتگوت گـەردنى بووكـە شووشـەى زيوينـە، ئەوەنـدە سـافو سپىو سۆڵ بـوو، باسـكەكانى قـەوى بـوون، مـووى رەش بـوو، قژەسـەرى زۆر پـڕ بـوو، زۆرجـار قژەسـەرى دەيـدا لـەناو شـانى، يـان دەيـدا لـە نـەرمى گوێـچكەى، جاروباريش سەرى خۆى دەتاشى، قژى كەمێك لـوول بـوو، بـەڵام لـوولێكى كـرژى وەك قولەڕشەكان نا، خاوێكى بێ تاميش نەبوو، مووى سەر سينگى وەك كلاَفـە هەتا سەر ناوكى قەتارەى بەستبوو، جاروبار مووى سەرى دەگرتە خەنە، يان بـە رەنگى زەرد بۆيەى دەكرد، مووى ريشى رەشو پڕبوو، نە تەنك بوو نە درێژ، لـە پانىو درێژى ريشى دەگرت، هەميشە شانەى دەكردو بۆنى خۆشى لێ دەدا، هەروا قژەسەرى شانە دەكردو چەورى دەكردو بـۆنى خۆشـى لێ دەدا، لـە سـەرەتاوە بـۆ موافەقـەى خـاوەن نامـەكان وەك ئـەوان قـژى خـۆى بـە دەورى سـەريدا شـۆڕ

دەکردەوە، بەڵام لە دوایی‌دا قژی خۆی لە ناوەڕاستی سەریدا دەکرد بە دوو بەشەوەو بەشێکی بەلای راستی‌داو بەشێکی بەلای چەپیدا بەردەدایەوە، ترمزی‌و ئەبو داود دەگێڕنەوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە تەشریفی چوو بۆ مەدینە، چوار پەلکەی هەبوو!

هەردوو سەرشانەکانی‌و هەردوو باسکەکانی‌و لای سەرووی سینگی توکن بوو، بە ڕاستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شێوەی شیرین بوو، سیمای نوورین بوو، هەتا بڵێی رەفتاری بەرز بوو، کرداری جوان بوو، کەس وەك حەسەنی ئیمامی عەلی شێوەی لە پێغەمبەر نەدەچوو (دروودی خوا لەسەر پێغەمبەرو خانەوادەی نازدارو نازیزی بێت) شەوقی روخساری نازداری حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وەك شمشێری بریقەدار وابوو، دەموچاوی وەك مانگی چواردە گەش‌و پان‌و جوان‌و خڕبوو، کاتێ سرووشتی بۆ هات‌و بووبە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەمەنی چل ساڵ بوو، کات مانگی رەمەزان بوو، شوێن ئەشکەوتی حیراء بوو.

حیراء کێوێکە لە کێوەکانی دەوری مەککە، فریشتەی سرووش: کە وەحییەکەی بۆ هێنا حەزرەتی جبرائیل بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرەتای سورەتی (علق)ی بە نیگا – واتە: (وەحی) – بۆ هێنا، ڕۆژی دوو شەممە بوو، حەفدەی مانگی ڕەمەزان بوو، لەپاش هاتنی سرووش سیازدە ساڵ لە مەککە مایەوە، لەو ماوەیەدا سەروومڕ سەرگەرمی راگەیاندنی پەیامەکەی بوو، لە پاشا بۆ هەمان مەبەست کۆچی کرد بۆ شاری مەدینەی پیرۆز، دە ساڵ لە مەدینە مایەوە، لە تەمەنی شەست‌و سێ ساڵیدا وەفاتی کررد.

گۆڕی پیرۆزی وا لە مەدینە، لەناو هۆدەکەی حەزرەتی عائیشەدا، چەند ڕۆژێك لەپێش مەرگیدا لە ماڵی عائیشەی هاوسەری مایەوە هەتا گیانی پاکی



سپارد، ئـەوجا بـە شاڵی یەمـەنی دایـان پۆشـی، ئەوسا عـەلیو فضلو ئوسامەی کوڕی زەید شۆردیان، وە لە سێ لۆجلی یەمەنی سپی خاوێنی لۆکەدا کفن کـرا، شەقرانی نۆکەری پارچەیێ قەیفـەی لـەناو گۆڕەکەیـدا بـۆ تەرمەکـەی راخـست، عەلیو فضلو ئوسامەی کوڕی زەید دایان هێلایـە نـاو گۆڕەکەیـەوە، موسـوڵمانان هەرکەسەو بۆخۆی بە تەنیا نوێـژی مردوویـان لەسـەر تەرمەکـەی کـرد، ئـەوجا لەناو هۆدەیەکدا کە تیادا وەفاتی کرد، ناشتیان ئێستا گومەزێکی سـەوزی لەسـەر کراوە، ناوداره بە (القبة الخضراء).

کاتێ وەفاتی کـرد هـەمووی (٢٠) مـووی سـپی لـە سـەرو ریـشیدا نـەبوو، بەڵام پێشە سەریو چاڵی چەناگەی کەمێك بۆز بوبوو، کە چـەوری دەکـرد دیـار نـەبوو، بـەڵام کـە قژەسـەری دەژاکـا مـوووە سـپییەکان دەردەکـەوتن، لـە کـاتی ڕۆیشتن کەمێك بە بەردا دەینواند، دەتگوت: تـەنگی زەوی بـۆ دەکێـشرێت، کاتـێ ئاوڕی دەایەوە بە تەواوی ئاوڕی دەدایەوەو رووی دەکردە هاودەمەکەی.

دەڵێن پێکەنینی قاقاو باوێشكو ئیحتیلامی نەبووە، قـەتیش کوڕنووشـی بۆ بت نەبردووە، خودای گەورە لەوە پاراستوویەتی.

مۆری پێغەمبەرایەتی بەناو شانیەوە بوو، بەقەد دوگمەی پەردە کوللەیێ دەبوو، وەك هێلکەی کەو نەخـشین بـوو، لەشـێوەی دەسـتی نووقـاودا بـوو، ووردە خاڵێکی زۆری پێوە بوو لە چەشـنی ووردە بالووکـە! هەمیـشە رووی خـۆش بـوو، زۆر جاران زەردەخەنـە دەیگـرت، ددانـە چوارینەکەی لـە ریـزی خـوارەوە لـەلای راستەوە، لە غەززای ئوحوددا شکابوو.

دەنگی گەورە بوو، دەنگی زۆر خۆش بوو، زۆر زۆر کاریگـەرو بـە تەئـسیر بوو، جوبەیری کوڕی موتعیم (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: جارێ لە نوێژی شێواندا، پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسـەر بـێ) سـورەتی (والطّـورِ)ی خوێنـد،

کاتێ گەیشتە سەر ئەم ئایەتانە: کە دەفەرموون: ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ﴾ هەتا ﴿الْمُسَيْطِرُونَ﴾ وا بەجوانیو بە تەئسیر خوێندی کاری تێکردمو سامو شکۆیەکی وا گرتمی وەخت بوو دڵم بفرێتو بەندی دڵم بپچڕێ!

**چوارەم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر گرنگی دەدا بە پاكوخاوێنی**، بە تایبەتی هی جلو بەرگو هی خواردنو خواردنەوەو جێگەو شوێنو هی دڵو دەروونو جەستە، هەروا گرنگی دەدا بە بۆنی خۆش، بۆنی خۆشی بەکار دەهێنا، خۆیشی (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆنی زۆر خۆش بوو، ئیمامی ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ): کە دە ساڵی ڕێك خزمەتی پێغەمبەری کردووە، دەفەرموێ: (هەرگیز بۆنی هیچ شتێکم نەکردووە: کە بۆنی لە بۆنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشتر بێت، لە ڕاستیدا بۆنی پێغەمبەر لە بۆنی میسكو عەنبەریش خۆشتر بوو! هەرگیز دەستم لە هیچ نەداوە: کە وەك جەستەی پێغەمبەر ئاوا نەرمو شلو ناسكو نازدار بێت، هەتا لە ئاوریشمو دیباجیش نەرمو نازدارتر بوو).

جابیری کوڕی سەمورە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێت: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی وا فێنكو بۆنی وا خۆش بوو دەتگوت: کردویەتی بەناو قوتوی گوڵاو فرۆشدا، یا لە شووشەی گوڵاوی هەڵکێشاوە).

گەلێ جار ئارەقی پێغەمبەریان دەگرتو دەیانکردە ناو گوڵاوەوە هەتا بۆن خۆشتری بکات! بۆیە هۆنەر دەفەرموێت:

قوربانی ناوت چەند خۆشە

ئارەقت گوڵاو بۆنت وەنەوشە

بەڵێ پێغەمبەری خوا (دروودی خودای لەسەر بێ) هەستێکی زۆر ناسکی هەبوو، حەزی لە شتی پاك بوو، حەزی لە بۆنی خۆش بوو، حەزی لە دەنگەو دەنگو قرەقرِ نەبوو، حەزی لە ئارامی بوو، بۆنی ناخۆشی زۆر پێ ناخۆش بوو، وەك بۆنی سیرو پیازو شتی تری وا.

**پێنجەم: چۆنیەتی قسەکردنی:**

خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لە قسەکردندا بەپەلە نەبوو، رِستە بەرِستە بواری دەدا، زۆربەی فەرمایشتەکانیشی کورتو پوختو رِەوانو ئاسانو رِەوانبێژو پرِ مەعنا بوون، لە شێوەی قسەی نەستەقو پەندی پێشینان بەهێزو سەرەنج رِاکێش بوون، لەبەر ئەوە زۆر بە ئاسانی فەرمایشتەکانی لەبەر دەکران، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَى – الأعلى/٨﴾ دیسان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ – القمر/١٧﴾ ئەم ئایەتە بەیزاوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئاوا رِافەی دەکات: (بەهۆی کورتیو پوختییەوە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ لەبەر کردن) جا لە شوێنێ: کە قورئان ئاوا ئامادەو ئاسان کرابێ بۆ لەبەرکردن، دەبێ سوننەت باشتر ئامادەو ئاسان کرابێ بۆ لەبەرکردن چونکە سوننەت رِافەو موبەیینە، رِافەش دەبێت لە رِافە بۆ کراو روونترو ئاسان تر بێت، دەنا رِۆڵی خۆی نابینێت.

فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەق وەك ئایەتەکانی قوورئان بە بێژەی رەسەنو بە رِستەی رِەوان دارِێژراون، لەبەر ئەوە ئەگەر کەسێ یەکە یەکە قسەکانی پێغەمبەری بژماردایە، وشە بە وشە دەیانی ژمارد، گەڵێ جار: کە وتەیەکی دەفەرموو سێ جار دوبارەی دەکردەوە، هەتا بە باشی ئامادەبووان لێی تێبگەن، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کەم دوو کەم خۆرو کەم خەو بوو، بە سێ پەنجە نانی دەخوارد، زۆر بێ دەنگ بوو، تا





پێویست نەبوایە فەرمایش نەدەفەرموو، قسەی بە نقام بوو، فەرمایشتی زۆر ڕێك‌وپێك بوو.

**شەشەم: چۆنێتی پێکەنینی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ):**

جابری کوڕی سەموره (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) زۆر بێ دەنگ بوو زۆریش کەم دوو بوو، زۆر کەمیش پێدەکەنی، بەڵام جاروبار لە ڕوداوی خۆشی ناو یارانی وا پێدەکەنی: کە کاکیلەی دەردەکەوت.

**حەوتەم: خەوتنی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ):**

حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) بە چاوی دەخەوت، بەڵام بە دڵ وریا بوو، هەرگیز دڵی نەدەخەوت، هەمیشە دڵی لای خوا بوو، هەرگیز دڵی نەدەخەوت، بە هەناسە لە خوا غافڵ نەبوو، هەموو شەوێ لە خەو هەڵدەستا بۆ شەو نوێژو بۆ پاڕانەوەو نزا، جاروبار بە ڕۆژیش دەخەوت، لەکاتی خەودا کەمێ پرخەی دەهات، گەڵێ جار لە خەوندا سروشتی بۆ دەهات، گەڵێ خەونی جوان جوانی دیوە، لە سوننەتدا تۆمار کراون.

**هەشتەم: ڕەفتارە شیرینەکانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ):**

خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) ڕەفتاری زۆر بەرز بوو، حەزرەتی عائیشەی هاوسەری لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (ڕەفتاری پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ڕەنگدانەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بوو) بە ڕاستی ڕەفتاری زۆر بەرز بوو، کاتی خۆی قەت بە فیڕۆ نەدەدا، هەمیشە سەرگەرمی تێکۆشانو هەوڵدانو خواپەرستی بوو، حەزی لە کارو فەرمان بوو، لەشی زۆر سوك بوو، دژی تەمەڵیو تەوەزەلی بوو، قەت لە یادی خوای گەورە بێ

ئاگا نەبوو، هەمیشە نوێژی بە جەماعەت دەکرد، وە خۆی بەرنوێژی بۆ یارانی دەکرد، شەونوێژێکی زۆری کردبوو بە پیشەی شەوی، ئەوەندە لە شەو نوێژدا راوەستا بوو، هەردوو لاقەکانی پەناما بوون، زۆر زۆر ڕۆژووی سوننەتی دەگرت، زۆربەی کات دوو شەممانو پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبوو، هەتا بڵێی دەست بە خێرو سەخی بوو، بە تایبەتی لە مانگی ڕەمەزاندا زۆر بەخشندە بوو، هەموو ڕەمەزانێ دە ڕۆژ لەناو مزگەوتدا خەڵوەی دەکێشا، هەموو ڕەمەزانێ جوبرائیل (علیه السلام) گوێی لە حەزرەت دەگرت، یەك خەتمی پێ دەکرد، لەو ماوەیەدا فێری تەجویدو قیرائاتی دەکرد، بەڵام ئەو ساڵەی: کە تیایدا وەفاتی کرد، جوبرائیل (علیه السلام) دوو خەتمی پێ کرد.

پێغەمبەری خوا (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا بڵێی دڵو دەروونی گەورە بوو، راستگۆ بوو، قسە راستی وەك خۆی نەبوو، زۆر نەرمو نیان بوو، چەندە بڵێی ڕووخۆشو قسە شیرین بوو، مامەڵە خۆش بوو، زۆر بە سەبرو بە حەوسەڵە بوو، لەوپەڕی ئازاییو دلێریدا بوو، لە خوا نەبێ لە کەسی تر نەدەترسا، زۆر بە ڕەحم بوو، زۆر بە تەنگی نەتەوەی ئیسلامەوە بوو، زۆر بە پەرۆش بوو بۆ ئوممەتی، زۆرجار لە ترسی خودا دەگریا، بە تایبەتی لەکاتی نزاو پاڕانەوەو شەو نوێژو قورئان خوێندندا، گەڵێ جار فەرمانی دەکرد بە دەنگ خۆشەکانی یارانی، قورئانیان بە دەنگی خۆش دەخوێند، پێغەمبەریش بە دڵو کوڵ گوێی لێ دەگرتو دەستی دەکرد بە گریان.

موطریف (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێت: باوکم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم دی نوێژی دەکرد، لەناو نوێژەکەیدا لەبەر کوڵی گریان دەنگی سینگی دەتگوت ویزەی ئاشو گیزەی مەنجەڵە، خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) گەڵێ بە شەرمو شکۆ بوو، هەرزەو هەرزەگۆ نەبوو،

زۆر هێمن‌و سەلارو لەسەرخۆ بـوو، بـە پـشوو بـە حەوسـەڵە بـوو، زۆر بـێ هـەوا بوو، زۆر بە تەوەککول بوو، خاوەنی چاوپۆشی‌و لێبوردن بوو، زۆر ڕوخۆش بوو، مرقن‌و مۆن‌و دڵڕەق نەبوو، زۆر بە وەفا بوو، زۆر بە قنیات بوو، بە هیچ جۆرێ هەڵپەی بۆ ماڵی دنیا نەدەکرد، گوزەرانی خۆی‌و خێزانی زۆر سادەو ساکار بـوو، بە نان‌و ئاو هـەڵیان دەکـرد، لەگـەڵ خێـزان‌و مـاڵ‌و منـاڵی خۆیـدا زۆر مەشـرەب خـۆش بـوو، زۆر رەفتـار جـوان بـوو، قـەت دڵـی نەدەشـکاندن، منـاڵی خـۆی مـاچ دەکرد، سەری مناڵی تریشی ماچ دەکردو دەستی دەهێنا بەسەریانداو نزای باشی بـۆ دەکـردن، سـلاوی لـە کۆمـەڵی ژنـان دەکـرد، بـە ڕاسـتی هاوسـەرەکانی‌و مناڵەکانی‌و کەس‌وکارە خواپێداوەکانی، ماڵ‌و مناڵی رەحمەت بـوون، بـۆ تاعـەتی خـوا، بـۆ فەرمانبـەریی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـۆ پـشتیوانی ئیسلام، بۆ وێڵ‌و ماریفەت، نموونـەیێ بـوون لـە پێغەمبـەر خـۆی (دروودی خـوا لەسەر خۆی‌و رەزای خوا لە کەس‌وکاری).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بـۆ نەتەوەکـەی زۆر دڵـسۆز بـوو، لەناو یارانیدا وەك برایان وابوو، خۆی جیانەدەکردەوە لێیـان، قبـوڵی نـەدەکرد: کە کەس لەبەری هەڵسێ، لـە کوێـوە لـە کۆڕەکەیـدا جێگـەی چـۆڵ بوایـە لەوێـدا دادەنیشت، زۆر میوان پەروەر بوو، پیشەی هەمیشەی چاکە کردن بوو.

لە فەرمودەیەکی خاتو خەدیجەی یەکەم هاوسەری (رەزای خودای لێ بێ) ئاوا وەسـفی رەفتـاری جـوانی پێغەمبـەر دەکـاو دەفـەرموێت: (ئـەی پێغەمبـەری خـودا! تـۆ پیـاوێکی خـزم دۆسـتی‌و خزمـەتی خـزم‌و خـوێش دەکـەیت‌و پیـاوی کۆڵی‌و دەسەوسـان دەگریتـە مـل خـۆت‌و، بـاری ئـازاری سەرشـانی خـەڵك سـووك دەکەیت‌و دەیخەیتـە سـەر شـانی خـۆت‌و داڵـدەی بـێ نـەوایان دەدەیـت‌و زۆر زۆر بەخـشندەیت‌و میـوان پـەروەریت‌و یاریـدەی لێقـەوماوان دەدەیـت‌و زۆر زۆر

بەخشندەیتو یارمەتیو پیاوەتیو مەردایەتیت كردووە بە پیشەی هەمیشەت وە بە ئەركی سەرشانی خۆت بە جوانی هەڵدەستیت).

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) كەمە كەمە لەگەڵ یارانیدا سوعبەتو قسەی خۆشی دەكرد، جارێ بە ئەنەسی فەرموو: «(يَا ذَا الأُذُنَيْنِ: ئەی خاوەنی دوو گوێ!)» دەڵێن جارێكیش بە پیرەژنێ دەفەرمووێ: (پیرەژن ناچیتە بەهەشت!) پیرەژنەكە خەم دایدەگرێ، هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆی روون دەكاتەوە: كە مەبەست ئەوەیە بە پیرەژنی ناچیتە بەهەشت، چونكە خەڵكی بەهەشت سەرجەم جەهێڵو لاون.

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێی لە قسەو باسو سەرگوزشتەی یارانی دەگرت: كە لە هی سەردەمی نەزانی دەیانگێڕایەوە، هەروا گوێی لە شیعری جوانی یارانی دەگرت، جارجاریش خۆی بەڵگەی بە شیعری جوان دەهێنایەوەو شیعری جوانی دەخوێندەوە.

## نۆیەم: خەباتو تێكۆشانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ):

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ژیانیدا خەباتگێڕو تێكۆشەر بوو، پتر لە حەڤدە غەزای گەورە خۆی سەركردەی سوپای ئیسلام بووە تیایاندا، هەر لە منداڵییەوە، لەسەر بێشكەوە عینایەتو چاودێری خوای گەورەی لەگەڵدا بوو، لەبەر ئەوە قەت سوجدەی بۆ غەیری خوا نەبردووە، لە ژیانیدا خۆشیو ناخۆشی دیوە، كاروكاسبی حەڵاڵی كردووە، شوانی كردووە، كاروانیی كردووە، بازرگانی كردووە، سەفەری كردووە، لە سەفەرێكدا تەشریفی گەیشتە شام، لەبەر سەر ڕاستیو مامەڵە ساغیو دەست پاكیو ئەمینداری ناوی دەركردووە بە موحەممەدولئەمین، واتە: موحەممەدی هێمنو بێوەیو ئەمیندار، سێ حەجی كردووە، عەمرەی زۆر كردووە، جیهادو غەزای زۆر كردووە، بە

منـداڵی لـەناو منـداڵانا یـاری کـردووە! خێـرو صـەدەقەو قوربـانی زۆر زۆری کـردووە، موسـابەقەو پێـشبڕکێی لەگـەڵ یارانیـدا کـردووە، نـەخۆش کـەوتووە، دەرمانی بەکارهێناوە، کەڵەشاخی لەخۆی گرتووە، زامدار بووە، ددانی لە غـەزادا شکاوە، سەرئێشەیەکی لەگەڵدا بوو: لایێ لەسەری دەئێشا پێی دەڵێن (شقیقە) سەری لە نەخۆش دەدا، ئامۆژگاری دەکرد: کە خۆی دەرمـان بکـا، وە سـەر لـە پزیشك بدا، وە دوعاو نزای باشی بۆ دەکرد، لەگەڵ تەرمی مـردوودا دەچوو بـۆ سەر گۆڕسـتان، نوێـژی لەسـەر مـردوو دەکـرد، زۆر جار بـۆ پەنـدو ئامۆژگاریو یادگار سەردانی گۆڕستانی دەکردو سلاوی لێیان دەکردو بۆیـان دەپاڕایـەوە، سـێ ڕۆژ تـازێی بـۆ مـردووی خـۆی دەگـرت، حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بایـەخی بـە ڕۆشـنبیریو خوێنـدەواری دەدا، بـەلام خـۆی خوێنـدەوار نـەبوو. ڕەحمەت لە مەولەوی: کە دەفەرموێت:

لـــەوە عـــەجیو تـــر مـــوعجیزە مەشـــنەو
ئـــوممیو عەللامـــەو هـــەتیو وە ئـــەدەو!

ئەمە کورتەیەکی پوخت بوو، بە کورتی پـەتی لـە ژیاننانـەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) گـشتی لـە فەرمایـشتی ڕاسـتو دروسـت، لـە سەرچاوەی بـاوەڕپێکراو وەرگـیراوە، خـۆ ئەگـەر لاوازیو بـێ هێـزی لـە شـتێکیا هەبێ ئامـاژەی بـۆ کـراوە، هـەتا شـتی وا گەرچـی زۆر زۆر کـەم لـەم کورتەیـەدا رووی داوە، بەلام بەبێ حیکمەت نـەگوتراوە، جـا خـوا یـار بـێ ئـەم کورتەیـە بـۆ موسوڵمانانی بـاش بـۆ ئاشـقانی سـیرەتی حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەبـێ بـەهۆی ناسـینی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئـەوەیش گەورەترین ئاواتی مرۆی موسوڵمانی هوشیارە، چونکە خوا یار بێ دەبێ بـەهۆی خۆشەویـستی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هـەروا دەبـێ بـەهۆی

فێربوونی کاری شیرینو ڕەفتاری جوان بۆ موسوڵمان، چونکە جوانترین دروشم بۆ موسوڵمان ئەوەیە: کە لە گشت شتێکدا، کە مەودای پەیڕەی تیادا هەبێ، پێغەمبەری ئازیزو نازدار بکا بە سەرمەشق بۆ خۆیو چاوی لێ بکا، بەپێی توانا هەتا بۆی بلوێ، خووی پێغەمبەر بگرێو ڕەفتارو کردارو مامەڵەو هەڵسوکەوتی وەك هی ئەو جوان بێ ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ – الأحزاب/٢١﴾.

لە هەمان کاتدا دەبێ بەهۆی پیتو فەڕو پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرتن، دەق وەك ئەو بەهرانە: کە لە داستانەکانی ژیانی پێغەمبەرانو خواناسان وەردەگیرێن، کە لەناو قورئانو سوننەتی دروستدا باس کراون، وەك قورئان خۆی بە دەق دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ – یوسف/١١١﴾ ئەگەر ئێمە بە وردی سەرنجی مەنتوقو مەفهومو نەصصو ئاماژەو ناوەڕۆکی ئایەتەکانی قوورئان بدەین، دەبینین لە ناویاندا کورتەیەکی پوخت لە موجمەلی ژیاننامەی پێغەمبەرانو خواناسان تۆمار کراوە: کە ژیاننامەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕەنگدانەوەی ئەو پوختەیە، ئەوەتا لە قورئانا ئاماژە بۆ بنەچەو وەچەو باوكو دایكو باپیرو کوڕو کچو مامو خزمو هاوڕێو هاوزمانو هاوسەرو نۆکەرو براو خوشكو دایەنی پێغەمبەرانو خوناسان کراوە، باسی ناوو نازناوو کەس ناوو نیشانەو کارو پیشەو دەنگو ڕەنگو زێدو جێگەو ڕێگەوماڵو منالی هەندێکیان کراوە، باسی جەستەو ئەندامو بۆنو لاویو پیریو تەمەنو بەهێزیو بێ کەسیو نەخۆشیو موو و ریشو قەویو قۆڵی جەستەی هەندێکی تریان تۆمار ککراوە، باسی ئاژەڵو جلوبەرگو پێڵاوو عاساو شارو دێو زێدو کاروپیشەی بازێکی تریان کراوە، چۆنیەتی مامەڵەو کردارو گوفتاری دەستەیەکی تریان کراوە، ناوی زۆر

لـە ئەندامـەکانیان هێنـراوە، وەك دەسـتە سـپی‌یـەکـەی مووسـا، چـاوی کـوێری یەعقوب، باسی زمان (لوغەت)و نەتەوەو سەرجەلەو هاوپشتی‌یـان کـراوە، یاسـی جوانی‌و شێوە شیرینی‌و سیمای نوورینیان نوسراوە، وەك جوانی یوسف‌و ناسـك‌و نازداری ڕەنگ‌و رووی یارانی حەزرەت ﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ – الفتح/٢٩﴾ هەتا باسـی سـەربۆزی هەنـدێ لـە پێغەمبـەرانی تیادایـە ﴿وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا – مريم/٤﴾ وە باسی نەزۆکی هەندێ لە هاوسەرانی بازێکیـان کـراوە، چۆنیەتی دەنگ‌و شێوەی ڕۆیشتن‌و شێوەی ئاخاوتنی هەندێ تریان بـاس کـراوە، گوساغی‌و ڕەوانبێژی‌و قسەزانی‌و گیروگرفتی زمانی دەستەیێ تریان باس کـراوە، هەتا باسی خۆراکی ژنی زەیستانی تیادایە.

هەروا باسی خوازبێنی‌و مـارەیی پێغەمبـەر مووسـای تیادایـە، باسـی ئـەو گیانلەبـەرو مـەل‌و مـۆرو جانەوەرانـەی تیادایـە: کـە قـسەو گفتوگۆیـان لەگـەڵ هەندێك پێغەمبەران کردووە، باسی عەجاییاتی لە دایك بوونی عیساو مووسـای تیادایە، باسی نەخۆشی‌و خەوبینین‌و خۆدەرمان کردنی هەنـدێ لـە پێغەمبـەرن کراوە ﴿ارْكُضْ بِرِجْلِكَ هَذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ – ص/٤٢﴾.

فەرموو با بچینە خزمـەتی ئـەم دەقـە قورئـانی‌یـانـە: کـە سـەبارەت بـەم بابەتانە دەفەرموون ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ – الكهف/٦٠﴾ فتـی: واتـە: سـوختە، یان نۆکەر ﴿إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي – مريم/٤﴾. ﴿فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ – طه/١٢﴾. ﴿إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ – يوسف/٩٤﴾. ﴿اذْهَبُوا بِقَمِيصِي هَذَا – يوسف/٩٣﴾. ﴿فَارْتَدَّ بَصِيرًا – يوسف/٩٦﴾. ﴿وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً – الأنبياء/٧٢﴾. ﴿هِيَ عَصَايَ – طه/١٨﴾. ﴿وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسَانِي – طه/٢٧﴾. ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ – الأنبياء/٨٣﴾. ﴿وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَكُمْ – الأنبياء/٨٠﴾. ﴿وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ – سبأ/١٠﴾. ﴿وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا – الأنبياء/٩١﴾. ﴿أَنِ اصْنَعِ الْفُلْكَ

– المؤمنون/٢٧﴾. ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ – القصص/١٢﴾. ﴿ان ارضيعه﴾ ﴿غَضْبَانَ أَسِفًا – الأعراف/١٥٠﴾. ﴿لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي – طه/٩٤﴾. ﴿سَوْآتِهِمَا﴾. ﴿فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ – الأنبياء/٦٠﴾. ﴿إِنَّا كُنَّا نَسْتَنْسِخُ – الجاثية/٢٩﴾. ﴿نَخُوضُ وَنَلْعَبُ – التوبة/٦٥﴾. ﴿وَأَنْبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ – الصافات/١٤٦﴾. ﴿وَفَصْلَ الْخِطَابِ – ص/٢٠﴾. ﴿وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ – الذاريات/٢٩﴾. ﴿أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخًا – هود/٧٢﴾. ﴿وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ – نحل/١٠٣﴾. ﴿وَكَلْبُهُمْ بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِالْوَصِيدِ – الكهف/١٨﴾. ﴿فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ – الكهف/١٠﴾. ﴿وَذَا الْكِفْلِ – ص/٤٨﴾. ﴿وَذَا النُّونِ إِذْ ذَهَبَ مُغَاضِبًا – الأنبياء/٨٧﴾. ﴿ابْنَ مَرْيَمَ – المؤمنون/٥٠﴾. ﴿إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ – القصص/٢٦﴾. ﴿اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ – القصص/٣٢﴾. ﴿وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ – العنكبوت/٤٨﴾. ﴿وَاغْضُضْ مِنْ صَوْتِكَ – لقمان/١٩﴾. ﴿وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِبْ بِهِ وَلَا تَحْنَثْ – ص/٤٤﴾. ﴿فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ – الصافات/١٤١﴾. ﴿قَالَتْ نَمْلَةٌ – النمل/١٨﴾ ﴿مَا لِيَ لَا أَرَى الْهُدْهُدَ – النمل/٢٠﴾. ﴿وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا – مريم/٢٥﴾. ﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا – مريم/٢٦﴾. ﴿وَسَيِّدًا وَحَصُورًا – آل عمران/٣٩﴾. ﴿وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ – البقرة،٢٤٧﴾. ﴿أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ – هود/٨٠﴾. ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُنِيبٌ – هود/٧٥﴾.

**ئەوەتە لەم ئایەتەی تردا نازناوو ناوو کەسناوی حەزرەتی عیسا (علیه السلام) باس کراوە: ﴿اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ – آل عمران/٤٥﴾. بەپێی ئەم ئایەتە فریشتەی خودا مژدە دەدەن بە مەریەم: کە کوڕێکی دەبێت، خودا بۆخۆی ناوی ناوە مەسیح عیسای کوڕی مەریەم، مەریەم لەم هەواڵە سەرسامگەرە دەحەپەسێو دەفەرموێ: (چۆن چۆنی من منالم دەبێ**

خۆ هێشتا من هەر کچم‌و پیاو دەستی بۆ نەبردووم!). یان ئەم ئایەتەی تر: کە بە ڕۆشنی ئەوەی تیادایە: کە هەندێ لە خاسانی خودا لەناو سکی دیکیانەوە خودا پەروەردەیان دەکات‌و بە جوانی لەژێر چاودێری خۆیدا گەورە دەبن‌و روو لەخوا دەبن‌و لە گوناهو تاوان دوور دەبن: ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنْبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا – آل عمران/٣٧﴾. یان لە هەندێ ئایەتی تردا باسی دەستە سپیەکەی موساو رەنگی سپێنەی چاوی یەعقوب‌و باری دەروونی دەکا: ﴿وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ – يوسف/٨٤﴾. یان لە باسی ڕەوانبێژی هاروندا دەفەرموێ: ﴿هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي – القصص/٣٤﴾. یان قورئان دەفەرموێت: ﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ نَبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ – آل عمران/١٤٦﴾. ﴿وَزِيرًا مِنْ أَهْلِي ، هَارُونَ أَخِي – طه/٢٩ – ٣٠﴾ ﴿أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا – العنكبوت/١٤﴾. ﴿مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا – آل عمران/٦٧﴾. ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ – آل عمران/١٥٩﴾. ﴿وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ – آل عمران/١٥٩﴾. ﴿وَانْظُرْ إِلَى حِمَارِكَ – البقرة/٢٥٩﴾.

ئەمە چەند نمونەیەکە لە هەواڵ‌و حاڵی پێغەمبەران لە قورئاندا، لە سوننەتی صەحیحدا زۆر بە درێژتر باسیان کراوە، بۆ نموونە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: زەکەریا (علیه السلام) دارتاش بوو (موسلیم). کەچی ئەگەر ئێمە شتێ لەمانە لە ژیانی پێغەمبەر باس بکەین، سەرلێشێواوەکان لێمان رادەپەڕن‌و دەڵێن: ئەمەت لە کوێ بوو؟ چۆن فریشتە مژدە دەدەن بە ئامینەی دایکی پێغەمبەر؟ چۆن‌و چۆن‌و چۆن؟ (تکایە بڕوانە: تاج – ٤/ل – ٣٧٥ - ٣٩٢).

هەروا ئەم پوختەیە لە ژیاننامەی سەرومر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەبێ بەهۆی دڵنەرمی‌و ئارامی دەروون‌و هۆی خشوع‌و خوضوع گەردن کەچی

بۆ خـوداى گـەورە، بـە تايبـەتى لـەناو نوێـژدا، لـە مغنـى المحتـاج‌دا دەفـەرموێت: (سـوننەتە نوێژكـەر دڵ بداتــە نوێژەكـەى، لــە مــەعناى قورئانەكـەو زيكــرو ويردەكان باش تێ فكرێ).

ئيمامى غـەزاليش (رەحمـەتى خـوداى لێ بێ) لـە ئيحيـاودا دەفـەرموێت: (نوێژ خوێن لـە تەحياتـدا كاتـێ دەڵـێ: «الـسَّلَامُ عَلَيْـكَ أَيُّهَـا النَّبِـىُّ وَرَحْمَـةُ اللّٰـهِ وَبَرَكَاتُـهُ» واتـە: ئـەى پێغەمبـەرى خـوا! ئـەى حـەزرەتى موحەممـەدى كـوڕى عەبدوڵلا! سڵاوو رەحمەتو بەرەكاتى خوات لەسەر بێ) دەفەرموێ: لـەم كاتـەدا شەخسى پێغەمبەرى نازدار لەسەر شێوەى موبارەكى خۆى: كـە لـەناو سـوننەتدا باس كراوە، بهێنێتە بەرچاوى خۆى‌و لـەناو دڵيـدا حـازرى بكـاو لەهـەمان كاتـدا باوەڕى تەواوى وابێ: كە سڵاو كردنەكەى دەگات بە پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسەر بێ)و پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لەناو گۆڕەكەيـەوە لەسـەر شێوەيەكى جوانتر وەڵامى دەداتەوە).

پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هـەر كەسـێ سـەلامم لێ بكات، خودا گيانم دەكاتەوە بە بـەردا، هـەتا سـەلامەكەى دەسـەندمەوە) ئـەبو داود بە سەنەدێكى ساڵح‌و بەيهـەقى بـە سـەنەدێكى سـەحيح گێڕاويانەتـەوە، لـە فەرموودەيـەكى تـردا سـەرورەر (درووى خـوداى لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (لـە هەركوێ بوون سڵاوتم لەسەر بدەن چونكە سڵاوتەكەتانم پـێ دەگاتـەوە) ئـەبو داود بە سەنەدێكى حەسەن گێڕاويەتەوە.

ئەگـەر كەسـێ بپرسـێ: ئەمـەى غـەزالى دەيفـەرموێ سـەر دەكێـشێ بـۆ تەفـەككور فيــشەيخو شــتى وا، دەڵــێين: لــە فەرموودەيــەكا: كــە موســليم گێڕاويەتيـەوە لـە باسـى ميعراجـدا خۆشەويـست (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (دەڵێـى ئێـستاش يونـسى كـوڕى مـەتتا وا لەبـەر چـاوەو تەماشـاى

شێوەو جلوبەرگو حاڵی دەکەم (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لە شەوی ئیسرادا دیم، جبەیەکی خوری لەبەردا بوو، سەرگەرمی لەببەیکە کردن بوو لەم شێوەی هەرشایەدا، بە سواری وشترە مێنگەیەکی سووری قەڵەوی پڕ گۆشت بوو، هەوسارەکەی گورزەیێ گوش بوو) ئەمە دەقە لەسەر ئەوە: کە تەفەککور لە حاڵی پێغەمبەران، لەسەر ئەو شێوەی کە وان تیادا کارێکی ڕەوایە، جوبەی خوری واتە: فەرەنجی (تاج — ٤/ل - ٣٨٧).

## بەشی دووەم لەم باسە پیرۆزە

هەندێ لە نیشانەو بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

بەردو دار سڵاویان لێ دەکرد، موسلیم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەردێ لە مەککە هەیە، بەر لەوە بکرێم بە پێغەمبەر، ئەو بەردە سڵاوی لێ دەکردم، ئێستاش دەزانم ئەو بەردە کامەیە) ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (جارێ لە مەککە لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچووین بۆ شوێنێ، لە ڕێگە تووشی هەر شاخو دارو درەختێ دەبوو، بە زمانێکی ڕەوان دەیگوت سڵاوت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خودا!).

ئاو لە نێوانی پەنجەکانیەوە وەك کانیاو هەڵدەقوڵا، بە بەرەکەتی نزای پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوو نانی زۆر زۆر کەم، زۆر زۆر دەبوو، چەوو بەردە وردە لەناو دەستیدا بە زمانێکی ڕەوان تەسبیحاتیان دەکرد، هەروا نانو ئاوو خۆراك کاتێ دادەنران لەبەردەمی خۆیو یارانیدا بۆ نۆش کردن، تەسبیحاتیان دەکرد، بنکە دار خورمایێ هەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە وتاری ڕۆژی هەینیدا شانی پێوە دەدا، کاتێ مینبەریان بۆ

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دروست کرد، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە یەکەم ڕۆژی هەینیدا چووە سەر دوانگەکە، بنکەدار خورماکە غوربەتی هەڵساو دڵی پڕ بوو، وەك مندالْ بەدوای دایکیدا بگری، ئاوا بەدوای پێغەمبەردا، لەبەرچاوی گشت نوێژکەرەکان دەستی کرد بە گریانو کوڵی نەنیشتەوە هەتا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە دوانگەکە دابەزیو چوو بۆلایو دەستی کردە ملیو ئاشتی کردەوە، ئەوجا کۆتەرە دارەکە ژیر بووەوەو بێ دەنگ بوو. عەللامەی عەینی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە شەرحی سەحیحی بوخاریدا دەفەرموێت: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەڵێی پێیدا: کە بیکات بە نەمامو بە دەستی خۆی لە بەهەشتدا بینێژێو خۆشەویستانی خودا لە بەرەکەی بخۆن، ئیتر ئەویش بەوە ڕازی بوو، وە ژیر بووەوە).

دارو بەردو درەخت شوێن پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەکەوتنو فەرمانی ئەویان بەجێ دەهێنا، هەیان بوو شایەتی دەدا بۆی: کە هەق پێغەمبەری خوایە، وەك دار سەموورەکەی: کە هاتە خزمەتیو سێ جار بە زمانێکی ڕەوان شایەتومانی هێنا بە شانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وەك ئەو هێشوە خورمایە : کە بۆ تەسدیقی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە دار خورماکە هاتە خوارەوەو لە خزمەت پێغەمبەردا دانیشت، لە پاشا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کرد چووەوە جێگەکەی جارانی خۆی، دوعاو نزای زۆر زۆر گیرا دەبوو، لەم بارەیەوە نموونەی زۆر زۆر هەیە، پێویست بە گوتن ناکات، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) غەیبزان نەبوو، بەڵام بە فەرمانی خودا هەواڵی لە غەیبیات دەدا، وەك ئەوە لە غەزای بەدردا جێگەی کوشتنی چەند کەسێکی لە سەرکردەکانی بت پەرستەکان

لە مەیدانی شەڕەکەدا لەسەر زەوی نیشانە کرد، وە چۆنی فەرموو ڕێك وا دەرچوو، مانگ بە ئاماژەی پەنجەی شایەتومانی شەق بوو، جوبرائیلو میکائیل دڵی پێغەمبەریان لەت کردو لە تەشتێکی زێڕدا بە ئاوی زەمزەم شۆردیانو پڕیان کرد لە نوورو زانستو حیکمەتو دانایيو ئیمان، ئەوجا قەپاتیان کردەوەو نایانەوە ناو جێگەی خۆی لەناو سینگیداو سینگیشی قەپات دەکەنەوە.

ئەم داستانی شەق کردنی سینگی پێغەمبەرە (درووودی خودای لەسەر بێ) چەند جارێ ڕووی داوە، جارێکیان بە منداڵی بووە، ئیمامی ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (جارێ هێشتا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) منالْ دەبێ، هێشتا لەلای دایە حەلیمەی دایەنی دەبێت، لەناو منداڵاندا یاری دەکا، جوبرائیل (علیه السلام) دەیگرێو دەیدا بە زەویداو سینگی لەت دەکاو دڵی دەردەهێنێو پارچەیەکی وەك زالووی لێ دەردەهێنێت!).

دیسان ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (....... زۆر جاران شوێنی ئەو شەق کردنەم بە سینگی پێغەمبەرەوە دیوە، کە وەك خەتێ وابوو، جێگەی تەقەڵەکان لەسەر سینگی: کە دوریبویانەوە، وەك کلافە ڕێچکەیان بەستبوو).

سوبحانەڵلا! ئێستاش: کە دڵ عەمەلیات دەکرێت زۆر جاران پارچەیێ خوێنی مەییوی وەك زالووی لێ دەردەهێنرێو شوێنەواری تەقەڵەکانی دوورینەوە، هەتا مردن وەك کلافەی دەزوی کەمێ بادراو دیارە!

## موعجیزەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

گەورەترین‌و نەمرترین موعجیزەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانی پیرۆزە، ئەگەر کەسێ بە باشی لە مەبناو مەعناو مەبەستە بەرزەکانی قورئان تێ بگا، ئیتر پێویستی بە بەڵگەی تر نامێنێ بۆ باوەڕکردنی تەواو بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدی نازدار (دروودی خودای لەسەر بێ) دڵنیام: کە هۆی سەرەکی دڵنیابوونی گەورە پیاوانی ئیسلام، لە راست‌و دروستی پەیامی ئیسلام، لە کۆن‌و نوێدا، دەگەڕێتەوە بۆ دەرکی ئەم حەقیقەتە، زانایانی وەك حەسەنی بەسری‌و شافیعی‌و نەوەوی‌و شێخی سیوتی‌و سەعدی تەفتازانی‌و مەلای پێنجوێنی‌و چۆڕی‌و قزڵجی‌و بێخودو مەحوی‌و مەولەوی‌و ناری‌و نالی‌و سەعدی‌و (سید قطب)، بە خۆڕایی نەبوون بە پەروانەی بە نوری عیشق سووتاوی دەوری ئەو چرای نورە!

بەڵێ هەموو کەس بەپێی تێگەیشتن‌و پلەی حاڵی بوونی لە علومی قورئان لە خوا نزیك دەبێتەوەو لە تەفرەی جیهان دوور دەکەوێتەوە، جا ئەگەر کەسێ ناوی سەحیحی سوننەت‌و سیرەتی راست‌و دروست بگەڕێ، بە سەدان موعجیزەی گەورە گەورە ئاشنا دەبێت‌و دڵنیا دەبێت لە ئیرهاسات‌و خەواریقی دەوروبەری هاتنی ئیسلام: کە موجمەلیان دەگاتە رادەی تەواتور، وە دڵنیا دەبێ لەوە: کە لەسەر دەستی پێغەمبەردا موعجیزەی گەورە گەورەی گەڵێ زۆر رووی داوە، وەك ئیسراو میعراج، شەققولقەمەر، وەك ئەوە لە غەزای خەیبەردا، مەڕێکی بریانی ژەهراویان بۆ دانا، دەستێکی مەڕە برژاوەکە هاتە زمان‌و عەرزی حەزرەتی کرد: من ژەهرم تێ کراوە بۆ ئێوە مەمخۆن!

وەك ئەوە حوشتر لە خزمەتیدا گریاوەو سکاڵای لەدەست خاوەنەکەی کردووە: کە ناهەقی لێ دەکاو ئەرکی زۆری دەدا بەسەرداو برسی‌و تینوی دەکا!

ئەی خودایە! ئێمە ئێستا دەستمان ناگاتە پێغەمبەرەکەی تۆ، هەتا وەك ئەو وشترە سکاڵای حاڵی خۆمانی لە خزمەتدا بکەین، خودایە! لە خزمەت تۆدا سکاڵا لەدەست ئەم سەرۆكو دووژمنانەی خۆمان دەکەین، کە بە ناهەق ژیانیان لێ تاڵ کردووین.[1]

وەك ئەوە هەندێ لە گیانلەبەران قسەو گفتوگۆیان لەگەڵدا کردووە، وەك چۆن بڕێ لە گیانلەبەران لەگەڵ پێشیناندا قسەیان کردووە، وەك مێرووولەو پەپوسلێمانە لەگەڵ حەزرەتی سلێمان قسەیان کردووە، کێو لەگەڵ داوددا تەسبیحاتی دەسەندەوە بۆی، هەروا مەلو مۆریش، ئەو گیانلەبەرانەی قسەیان لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) کردووە وەك: گورگو ئاسكو ووشترو بزنمژە، جا لەبەر ئەم گشتە هۆیە جوان جوانانە ئیسلام لە هەموو چاخێکدا بە تایبەتی لەم سەدەی بیستەمەدا، لەناو هەموو ئاینەکانی تردا، بووە بە دینی رۆشنبیران، بەڵێ کارێکی گەلێك ئاساییە، کە لەم سەدەی بیستەمەدا: کە چەرخی کارەباو لێزەرو تەکنەلۆجیاو مانگی دەستکردو هاموشۆی نێوان هەسارەکانە، ئالەم چەرخی نووری عیلمەدا: کە زانست جێگەی بە جەهلو نەزانیو خورافاتو ئەفسانەو مەفسانەو تەثلیتو ئیشراكو فرە خواییو پەرستنی بەشەر لەلایەنی بەشەرێکی تری وەك خۆیەوە، کە زانست جێگەی بەم بیروباوەڕە چەوتو چەوێلانە لەق کردووە: کە نەخوێندەواریو

---

[1] مەبەست لە (سەرۆكو دوژمنانەی خۆمان) صەدامو حیزبی بەعث بوو، خودایە! ئەمجارەش چۆن صەدامو حزبی بەعث کرد بە پەندی بات، ئەم حوکمڕانانەی ئێستای عێراقو سووریا، لە صەدامو حیزبی بەعث خراپتر بکەی بە پەندی بات. ئامین

نوری فارس

٢٠١٦/٣/١٨

کۆنەپەرستیو چاولێکەریی کوێرانە ئاو چۆتە ژێریانو گلۆڵەیان کەوتۆتە لێژیو باویان بەسەر چووە، ئالەم سەردەمە زێڕینەدا: کە بیروباوەڕ ئازادە، کە کۆتو زنجیری سەر هۆشو لەش لە زۆربەی جیهاندا پساوەو وەك جاران هۆشو گۆش کەلەپچە نەکراون، ئالەم ڕۆژی جەژنی ئازادی بیروباوەڕەدا لە یابانو ئەوروپاو ئەمەریکاو وڵاتە پێشکەوتووەکان، ڕۆژانە مەردوم کۆمەڵ کۆمەڵ، زاناو داناو خوێنەوارو نووسەرو ئەدیبو کاسبو کرێکارو ڕۆشنبیر، بە قەناعەتی تەواوەوە دەست لە دینی پووچەڵی میراتی باوباپیریان هەڵدەگرنو بەبێ ئەوەی: کە کەسێ زۆریان لێ بکا، یان تەماعی ماڵی دونیاو جاهی کۆمەڵایەتییان بخاتە بەر، هەرکە لە جەوهەری ئیسلام حاڵی دەبنو دڵو دەروونیان بە نوری قورئان گەش دەبێتەوە ئیتر یەکسەر وەك پەروانەیێ ئەشقی چرا ببێ، یان بولبولێ شەیدای گوڵ بێ، ئاوا بەبێ پەروا شەیدای ئیسلام دەبنو ئیعلانی ئیسلام دەکەنو بێزاری لە دینو باوەڕی پوچەڵی کۆنی خۆیان دەردەبڕنو بەوپەڕی تواناوە دەبن بە سەربازی فیداکاری ئیسلام.

وە لە ڕۆژنامەو گۆڤارو لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بە بەشی دەنگو ڕەنگو خامەو نامەیەوە، دەست دەکەن بە خزمەتی ئیسلام، وە بە پەخشو ڕاگەیاندنی، وە دەبن بە سەرمەشقو پێشەنگ بۆ کەسانی تریش، تەنانەت لە سایەی خوداوە ئەم دیاردەیە وا پەرەی سەندووەو پەخشەوە بوونی ئیسلام لە سەراسەری جیهاندا وابووە بە باو، بووە بە ئاشکراترین دیاردەی سەردەم، لەبەر ئەوە ئومێد لە ڕەحمەتی خودا دەکرێت: کە ئیسلام لە ڕۆژئاواوە بەرەو نیشتمانی پێشینی جارانی خۆی بە سەرکەوتوویی بە گیانێکی نوێوە بگەڕێتەوە،




ئەمە خەوو وڕێنە نىيە، خوا يار بێ ئەمە پێشبينى ئايندەى ئاسۆى روونى پەيامى پيرۆزى ئيسلامە لەسەر ئاستى جيهانى.[*]

لە گفتوگۆكەى نێوان ئەبو سوفيانو هيرقەلدا، هيرقەل دەڵێ: (لە راستيدا هەركاتێ دڵ خۆشى باوەڕو ئيمان بچێژێو تامو چێژى شيرينىيەكەى وەربگرێ ئيتر هەتا هەتايە ئەو فێنكى باوەڕە لەو دڵە ئارامە دەرناچێو هەردوولا دەبن بە گوڵو بولبول) تا ئەوێ: كە دەفەرموێ: (كاتێ خۆرهەڵهات بەرەبەرە سوپاى تاريكىو زۆرو ستەمو لەشكرى كوفرو ناهەقى، ئاو دەچێتە ژێريانو گلۆڵەيان دەكەوێتە لێژى!).

كەسێ بە چاوى ژيرى سەرنج لە نەخشەى جيهانو حاڵى گەلى ئيسلامو بارووەدۆخى ئاڵۆزى ناو دانيشتوانى سەرگۆى زەوى بدا، قەناعەت دەكا: كە ئەم تێكەو لێكەو تێكەڵو پێكەڵىيە دەوام ناكا، وە لەبەر رۆشنايى ئەم دوو ئايەتە مژدە بەخشانە، چاوەڕێى ئيمدادو ياريدەيەكى گەورەى خودايى دەكا، كە ببێ بە هەوێنى سەركەوتنێكى گەورە بۆ ئيسلام لەسەر ئاستى جيهانى! خواى گەورە دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ اللّٰهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَا أَنْتُمْ عَلَيْـهِ حَتَّـى يَمِيـزَ الْخَبِيـثَ مِـنَ الطَّيِّبِ – آل عمران/١٧٩﴾. بەڵێ ئەم ئايەتە پيرۆزە ئاماژەيەكى ئاشكرايە: كە هەركاتێ موسوڵمانان كەوتنە تەنگانەى گەورەوە، خاسو خراپ تێكەڵ بوون، خواى گەورە خۆى تەدەخول دەكا بۆ قازانجى گەلى ئيسلام، جا كەوابێ كاتى ئەوە هاتووە: كە ئەو وەعدو بەڵێنەى خودا كەوا لەم ئايەتەى تردا بێتە جێ:

---

[*] يەكێ لەم دياردانە ديانپيانانى ئەمريكايە بە ئيسلام، لە وڵاتى خۆياندا، ئێستا بووە بە قانوون رێز لە شەعائيرى ئيسلام دەگيرێ، پيرۆزبايى جەژنانو رەمەزان بە رەسمى لە موسوڵمانانى ئەمەريكا دەكرێ، داوا لە ئەزهەر دەكرێ پسپۆڕان بنێرن بۆ إصلاحى بەنديانو ئەمانە.

که دەفەرموێ: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ – فصلت/٥٣﴾. دەی ئەم بۆچوونەی: کە عەرززتان کرا، بناغەکەی لەسەر ئەم بنەمایە دامەزراوە: کە ئەم دوو ئایەتە ئاماژەی بۆ دەکەن! کە هیرقەلیش بە رۆشنبیری خۆی هەستی پێ کردووە.

## کۆتایی:

پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە تەمەنی (٢٥)ساڵیدا ژنی هێناوە، (٢) کوڕو (٤) کچی بووە، پێنجیان بەرودوا لەپێش خۆیەوە بە مردنی خوا مردوون، تەنیا فاتیمەی کچی (٦) شەش مانگ لە پاش خۆی ژیاوە، پێغەمبەر باوکی خۆی نەدیوە، پێنج شەش مانگان بووە لە سکی دایکیدا: کە باوکی مردووە، لە تەمەنی شەش حەوت ساڵیدا دایکیشی مردووە، لە کاتی پێغەمبەرێتیدا دێنی گۆڕی دایکی کردووەو لەسەر گۆڕەکەی گریاوە بۆی، وە ئەوانەی: کە لەگەڵیا بوون لەوێ ئەوانیش لەگەڵ پێغەمبەردا دەستیان کردووە بە گریان! لە تەمەنی (٤٠)ساڵیدا خودا کردی بە پێغەمبەر، ماوەی پێغەمبەرایەتییەکەی (٢٣) ساڵ بوو.

سەرنج بفەرموون ئەم گشت دەوڵەتو کۆمەڵو گەلو نەتەوە موسوڵمانانە، ئەم حەمکە وڵاتو نیشتمانو جێگە پیرۆزانە، ئەم گشت فێرگاو زانستگاو زانکۆو نامەخانەو لایەنو ڕێکخراوە ئیسلامیانە، ئەم حەمکە مزگەوتە، پتر لە یەك ملیار موسوڵمان، پتر لە پەنجا دەوڵەتی ئیسلامی، کە ئێستا هەموو ئەمانە وەك گوڵی بەهار پەخشو پرشن لەسەر ڕووی گۆی زەوی، ئەم حەمکە ڕەحمەتە، ئەم گشت خێرو بێری دینو دنیایە هەمووی بەری




خـەباتو تێکۆشـانی (٢٣) سـاڵی تاکـە یـەك کەسـەو بـەس: کـە حـەزرەتی موحەممەدە (دروودی خودای لەسەر بێ).

جـا لـەپاش ژیـانێکی پـڕ لـە هـەوڵو خـەباتو تێکۆشـان، وە لـە پـاش دامەزراندنی ئایینەکەی بە تەواوی بەبێ هیچ کەمو کورِییەك، ئەو کێوی نوورو عـیلمو عیرفـانو ئیمانـە، لـە تەمـەنی (٦٣) سـاڵیدا گیـانی پـاکی سـپارد، ئێـستا ئارامگـەی پـیرۆزی وا لـە (روضـة)ی شـەریفدا، لـە مەدینـەی نـازدار، ئەمـە (١٤) سەدەیە پۆل پۆل موسوڵمانان لـە هـەر چوارلاو گۆشـەی جیهانـەوە، بـە تایبـەتی لەکاتی حـەجو عـەمرەدا شـاد دەبـن بـە دیـدەنی ئارامگـەی پـیرۆزی، خۆشـی لـەو خودا پێداوەی: کە خـودا ئـەم بـەهرە پـیرۆزەی پـێ خـەڵات دەفـەرموێت، لـەخوا بەزیاد بێت: کە گەلی کوردی خۆشمـان لـە پـەیرِەوانی ئـایینی پیرۆزی حـەزرەتی (محمـد)ن، بـە درێـژایی مێـژووی ئیـسلام بـە هـەزاران هـەزار کـوردی مـەردی موسوڵمانی پاكو چاك لە کـاتی حـەجو عـەمرەدا، شـاد بـوون بـە دیـداری گـۆڕی پیرۆزیو چاویان بە دیدارو بە گەردو بـە سـەیری گـۆڕی پـیرۆزی ڕیـشتووەو بـە نووری جەمالی دڵو دەروونیان رۆشن بووەتەوە، هـەزار هـەزار سـوپاسو سـتایش بـۆ خـودای تـاكو تـەنیا، خوایـە! بـەشمانی تـێ بخـەی، ئێمـەو خوێنـەرانو بیـسەرانیو موسـوڵمانی بـاش لـەم نـازو بەهرەیـە بـێ بـەش نەکـەی، لـەم شـارە نازدارەی خۆماندا: کە شاری سلێمانی‌یـە: کـە شـارەکەی مـەلیك مـەحموودی یـاد نەمرە، یەکێ لەو حاجی‌یە کوردە خواپێداوانە حەزرەتی حاجی کـاك ئەحمـەدی شێخە جەنابی ئەحمەدی کاکی‌یە (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێت).

حـەزرەتی عائیـشە (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: (پێغەمبـەری خۆشەویـستو نـازدارو ئـازیز (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە سـەرەمەرگدا لـە

باوەشی خۆمدا بوو پشتی پیرۆزی دابوو بە سینگو بەرۆکمەوە: کە خوای گەورەو مەزنو پاكو پیرۆز گیانی کێشا).

پاڵفتەی مەبەست لە فەرموودەیەکی ساغ ئەمەیە: کە سڵاوات دانی زۆر لە دیداری پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) بە تایبەتی لەو کاتە تایبەتیانەدا: کە موسوڵمان تەرخانیان دەکات بۆ خواپەرستیو نوێژو زیکری خوا، سڵاوات دانی زۆری وا دەبێت بە مایەی پیرۆزی هەردوو جیهانو دەبێ بەهۆی هاتنەدی ئاواتو دەبێ بە ڕێگە چارەی ڕزگاری بوون لە هەموو سەخڵەتیو ناخۆشییەكو دەبێ بە کلیلی حەل بوونی گشت کێشەیەکی سڵاوات لێ دەرەکە، مەبەست ئەمەیە: کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئوبەییەی کوڕی کەعب (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: «إذًا تُكْفَى هَمَّكَ وَيُغْفَرُ لَكَ ذَنْبُكَ». ترمزی بە ڕشتەیەکی ساغ گێڕاویەتەوە (تاج — ١٦٥/٥) ئەمە لەلایەك وەکی تریش: سوپاسو ستایش بۆ خودای تاكو تەنیاو پاكو پیرۆز: کە بە میهرەبانی خۆی هیدایەتی داوین بۆ قەبوڵی ئیسلام، بۆ پەیڕەوی محمەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ خزمەتی نوری خودا، کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، کە خۆی بەڵێنی تەواو کردنی ئەو نورە درەخشانەی داوەو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ — الصف/٨﴾.

لە کۆتاییدا لەخوای گەورەو سەروەرو میهرەبان داواکارین: کە لە قیامەتدا ئەم کۆششو ئاهەنگو کۆڕەی خۆمان: کە لەم پێناوەدا پێی هەڵدەسین لەسەر ئەم شێوەو حاڵەی ئێستامان، بە هەمان شێوەو جلوبەرگەوە لە دەفتەری أعمالو تۆمارنامەی کردەوەی باشماندا، ڕێك وەك شریتو نەواری ڤیدیۆ ببینینەوەو بۆمان ببێ بە کلیلی ڕزگاری، وە بە سەربەرزیو ڕوسووری بە خزمەت پێغەمبەری خواو یارە نازدارەکانی بگەینو تێر تێر سەیری نووری

جەماليان بكەين، هەروەها بە خزمەت مامۆستاو فەقىّو دۆستو برادەرو خزمو كەسوكارو خۆشەويستانى خۆمان شاد ببينەوە، لە بەهەشتا لە خزمەتياندا بەوپەڕى شادىو خۆشييەوە پێكەوە دابنيشينو جەخارى دەردى دوورى ئازيزان لە دڵ دەركەين، وەك جارى جاران شادو شكور ببينەوە بە يەكو تێر تێر سەر بكەينەوە سەر رانى دايكو باوكمانو ئۆخەى بكەين.

ئازيزان! ئەى ئاشقانى بەرنامە پيرۆزەكەى محمەد (دروودى خوداى لەسەر بێ) خوا يار بێ ئێمەى دوعا گۆى ئێوە لەم مەولود نامەيەدا لە هێڵى راستو رەوانى قورئانى پيرۆزو لە رێبازى راستو دروستى سوننەتو لە شارێگەى سيرەتى راستەقينەى حەزرەت (درودى خوداى لەسەر بێ) دەرناچين، بە پشتى خوا لە بيدعەتو ئەفسانەو ئيسرائيليات زۆر دوور دەبين لە هەمان كاتدا هەقيشمان نييە بەسەر كەسانێكەوە: كە هەزارو يەك شەڵتاخو بوختان بۆ سەرجەمى ئوممەتى محمەد (درودى خوداى لەسەر بێ) دەكەنو بە قسەى ئەوان بێت هەر خۆيان موسوڵمانى ساخن، گوايە ئەو خەڵكەى تر هەمووى بيدعەتكارو شتى وان، تەنانەت خوێندنەوەى مەولودنامەش بە بيدعەت كارى دادەنێن، لە پاش ئەم روونكردنەوەيە عەرزتان دەكەين: لە قورئاندا دەفەرموێ: (پەپوو سلێمانە نامەى حەزرەتى سلێمانى دەبرد بۆ شاژنى يەمەنو هەواڵى ئەويشى دەهێنا بۆ سلێمان (رەزاى خوداى لێ بێ).

لە حەديسى (صەحيح)دا هەيە: كە بوخارى گێڕاويەتەوە دەفەرموێ: ئيماندارێ كاغەزێ دەنووسێتو لەگەڵ ئەمانەتێكدا دەيانخاتە ناو كۆتەرە دارێكەوەو كۆتەرە دارەكە دەدا بەدەم ئاوى دەرياوەو دەفەرموێ: خودايە من هەر ئەوەندەم لە توانادا هەيە دەى تۆش بە ڕەحمەتى خۆت ئەم نامەو ئەمانەتو سپاردەيەم بۆ بگەيەنە بە دەستى خاوەنى، وە خوداش نامەو

ئەمانەتەکە دەگەیەنێ بە دەستی خاوەنیو نزاکەی گیرا دەککات، هەروا لە فەرموودەیەکی بوخاریو موسلیمدا هاتووە: کە هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە کاتی دووریو سەختڵەتیو تەنگانەدا داوایان لە خوا دەکرد: کە سلاوو هەواڵیان بگەیەنێ بە پێغەمبەری خواو یارانیو عاصمی کوڕی ثابیت: کە سەرکردەی لقێ بوو، لە پێش شەهید بوونیا فەرمووی: «اللَّهُمَّ أَخْبِرْ عَنَّا رَسُولَكَ» ئەی خودایە هەواڵمان بە پێغەمبەرەکەت رابگەیەنە.

ئیمامی ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: قورئان خوێنەکان: کە ژمارەیان (٧٠) کەس بوو کاتێ گەمارۆدران لە پێش شەهیدبوونیاندا لە خودا داوا دەکەن: کە هەواڵو سلاویان بە پێغەمبەرو یارانی رابگەیەنێ، دەفەرموون: «بَلِّغُوا عَنَّا قَوْمَنَا ، أَنَّا لَقِينَا رَبَّنَا ، فَرَضِيَ عَنَّا وَأَرْضَانَا» واتە: (خودایە! هەواڵی حاڵمان رابگەیەنە بە گەلی ئیسلام، کەوا ئێمە شادبووین بە دیداری پەروەردگارمان، وە خودا لێمان ڕازییە، وە ڕازیشی کردووین).

لە تەحیاتیشدا هەموو جارێك نوێژخوێن چەند جارێ بە سیغەی نیدا خیتاب بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێت: «السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ» واتە: (سلاوو درودو رەحمەتو هەموو جۆرە پیتو پیرۆزیی خودات لەسەر بێت، ئەی پێغەمبەری خودا!).

لە باسی ئیسراو میعراجدا لە حەدیسی صەحیحدا هاتووە: کە پێغەمبەرانو شەهیدان لە ژیانی بەرزەخدا زیندوون تەنانەت پێغەمبەران جەستەشیان خاك نای ڕزێنێت، وە لە ژیانی بەرزەخدا هاموشۆی یەکتر دەکەن، سلاو لە یەکتر دەکەن مشووری گەلی خۆیان دەخۆن عیبادەت دەکەن، حەج دەکەن نوێژ دەکەن، لە شەوی ئیسرادا ئیبراهیم (رەزای خودای لێ بێ) سلاوی نارد بۆ ئوممەتی ئیسلام بە حەزرەتدا.

لە حەدیسی سەحیحدا هەیە: کە شەیخان گێڕاویانەتەوە: کە پێغەمبەری خودا لە شەوی ئیسراو میعراجدا قسەو گفتوگۆو راوێژ لەگەڵ پێغەمبەرەکان دەکاو ئیمامەتو بەرنوێژیان بۆ دەکات، وە بەهرە لە ئامۆژگاری حەزرەتی موسا وەردەگرێتو لەسەر راوێژی ئەو چەند جارێ دەچێتەوە خزمەتی خودا، هەتا ژمارەی نوێژە فەرزەکان لە پەنجاوە دەبن بە پێنج نوێژ، هەروا لە حەدیسێکی موسلیمدا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەو شەوە: کە چووم بۆ ئیسرا لەلای موساوە تێپەڕیم لەلای تەپۆڵکە لە سورەکەدا بوو، لەناو گۆڕەکەیدا نوێژی دەکرد).

لەسەرەتایشەوە ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد: کە بە دەقی فەرموودەی ساخ پەیوەندی گیانی لەنێوانی خۆشەویستو ئوممەتدا هەتا ڕۆژی قیامەت بەهۆی سەلاواتدانو خەونی دروستەوە دەمێنێ، وە گەلێ لەو خەونانە لەناو کتێبە گەورەکانی شەریعەتدا تۆمار کراون، قورئانیش دەفەرموێ: لە بارەی ژیانی شەهیدانەوە لە عالەمی بەرزەخدا: ﴿أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ، فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ – آل عمران/١٦٩ – ١٧٠﴾. هەروا دەفەرموێ: ﴿وَيَتَّخِذُ مَا يُنْفِقُ قُرُبَاتٍ عِنْدَ اللَّهِ وَصَلَوَاتِ الرَّسُولِ – التوبة/٩٩﴾ هەروا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ – التوبة/١٢٨﴾. (صدق الله العظيم).

لە پێشیشەوە رابورد: کە سەلاوات دانو سلاو کردنی موسوڵمان لەسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو گۆڕەکەیدا دەگاتەوە پێی، ئەوەتە پوختەی ئەم ئایەتو فەرمودانە بەڵگەی ڕۆشنن لەسەر ئەوە: کە پێغەمبەران (دروودی خودایان لەسەر بێ) لەناو گۆڕەکانیاندا زیندوونو عیبادەتی خودا دەکەنو قسەو دوعای خێر بۆ ئەهلی ئیمان دەکەنو بە تەنگی ئوممەتیانەوە

دێن، سەرنج بفەرموون: کە چۆن پێغەمبەران لە ژیانی بەرزەخدا بۆ بێ نازیو کەساسی گەلەکانیان پەرۆشن، لە حەدیسێکی سەحیحی بوخاریو موسلیمدا دەفەرموێ: (لە شەوی ئیسرادا موسا دەگریا، خودا لێی پرسی: «مَا أَبْكَاكَ قَالَ يَا رَبِّ ، هَذَا الْغُلاَمُ الَّذِى بُعِثَ بَعْدِى يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِهِ أَفْضَلُ مِمَّا يَدْخُلُ مِنْ أُمَّتِى»).

لە حەدیسێکی ئیمامی ترمزیدا ئەسماء دەفەرموێ: چووم بۆلای ئوم سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) روانیم ئوم سەلەمە دەگری، گوتم: خێرە بۆچی دەگری؟ فەرمووی: لە خەوما پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆڵ بە سەرو ریشیەوە بوو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە چ خێرتە بۆ وات لێ هاتووە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: نەختێ لەمەوبەر بە دیار حوسەینی کورمەوە بووم لەبەرچاوی خۆم کوشتیان.

جا وا بەندەش لەسەر ئەم بنیاتە داوا لەخوای گەورەو مەزن دەکەم: کە ئەم سلاوات‌و تکاو هەوالانەمان بگەیەنێ بە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سا بەڵکوو خودا بەر تکاو شەفاعەتی ئەو زاتەمان بخات، ئەی خۆشەویست! ئەی پێغەمبەری خودا! سلاوی خوات لێ بێت، رەحمەت‌و بەرەکات‌و سلاواتی خوات لەسەر بێت سلاوی فریشتەو سەرجەمی موسوڵمانانت لێ بێ، بە تایبەتی سلاوی گەلی کوردی سەرجەم موسوڵمانی ستەمدیدەت لێ بێت، سلاوی ئێمەت لێ بێ: کە ئەم کۆمەڵە موسوڵمانەین واین لەم جێگەیەدا، باوک‌و دایك بە قوربانت بێت، نووری بە قوربانی ئاستانەی پیرۆزت بێت، بەرین لەو کەسانەی: کە تۆ لێیان بەریت، تۆ رەهبەریت، تۆ سەرومەریت، تۆ پێغەمبەریت، تۆ نووریت، تۆ گەوهەریت، سوپاس‌و ستایش بۆ خوا: کە ئێمەی کردووە بە ئوممەتی تۆ، کە کوردستانی کردووە بە بەشێ لە خاکی پیرۆزی ئیسلام، کە نووری کردووە بە خادیمی شەریعەتی تۆ، ئێستاش کاتی ناردنی ئەم عەریزەیە: کە دەینێرین بۆ

خزمەتی تۆ، لەخوا داوا دەکەین کە بیگەیەنێت پێت، وە دوعاو نزاکانمان گیرا بکاو مرادمان بداو نائومێدمان نەکاو تۆمان لێ ڕازی بکاو بەر شەفاعەتو تکای تۆمان بخاتو لە هەردوو ژیانو لە هەردوو جیهاندا تۆ تکاکارو پارێزرمان بیتو قورئان چەتری سەر سەرمان بێت، داوامان لە خوای مەزن ئەوەیە: کە ئەم عەریزەیەمان بگەیەنێت بە دەستی تۆ:

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس بۆ خودا، درووود لە حەزرەت رمزا لەیاران، رەحمەت لە ئوممەت

خۆشەویستی خوا ئەحمەدی نازار تا چەکەرەو چووز شین دەکا بەهار

تا بانگ دەدرێ لە دێهاتو شار سڵاوات لە تۆ بە سەدان هەزار

تا گوڵ لە گوڵشەن دەشەکێتەوە بە شنۆی رەحمەت دڵ دەشنێتەوە

شەونم بە هەتاو دەشۆرێتەوە بارانی درووود داتگرێتەوە

تا مەل دەخوێنێ لەسەر چڵی دار بە شنەی باوەڕ دڵ دەبێ بێدار

بە شەوو بە ڕۆژ بێ حەددو شومار بۆ گیانی پاکت سڵاوی بۆندار

* * * * * *

ئەی خۆشەویستی گەلی کورد زمان ئەحمەدی سەرومر تاجی سەرسەرمان

بە قەد گەڵاو گیاو گوڵی کوردستان بارانی رەحمەت بدا لە گۆڕتان

کۆتری نامەبەر شنەبای رەحمەت رابەری نێوان حەزرەتو ئوممەت

تکام ئەمەیە کە بەبێ زەحمەت ئەم نامەم بەری بۆ خزمەت حەزرەت

لەپاش بەیانی عەرزی سڵاوم ئاواتی گەورەم ئەی نووری چاوم

بە سەیری دیدار بڕێژم چاوم بەڵکو بینا بێ هەتاکوو ماوم!

قوربـان! كـوردێكم ئەشـقى قورئانـت    نەك جارێ سـەدجار بم بـە قوربانـت

تەشــريفێ بێنــە بــۆ كوردســتانت    دوعــاى بــۆ بكــە، دەســتم دامانــت

وا لــە باوەشــيا زۆر لــە يارانــت    تامــەزرۆن لــە بــۆ ميهــرى جارانــت

وان لــە ئامێزيــا نوێنــەرى جوانــت    لــە خــزمو دۆســتو نــەوەو باوانــت!

بـۆ كـوردن بوونـە چـەترى ئەمانـەت    چــاوەڕێن لــەبۆ تەشــريف هێنانــت

كاتــێ تــەواوبوو گەشــتو سـەيرانت    بمبــە لەگــەڵ خــۆت بــۆ دەركــەوانت

كاتــێ كـوردێ هـات بـوو بـە ميوانـت    ئەگــــەر نـــــەيزانى كاكـــە زمانـــت

بفـــەرموو دەبم بـــە تـــەرجومانت    خـــودا بمكاتـــە بـــالآ گـــەردانت

رۆح بە قوربانت، سەر  بـە قوربانـت    چـاو بــە قوربانــت، دڵ بــە قوربانــت

**خادم العلماء والمشايخ**

**نورى فارس حەمەخان حەسەن قەرەداغى**

**١٩٩٨/١٢/١٥ – سلێمانى/ مامۆستايان**

# چەند بابەتێکی بە سوود سەبارەت بە سوننەت

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

سوپاس‌و ستایش بۆ خودای تاك‌و تەنها، درووودو سەلام لەسەر گیانی پێغەمبەری خودا، رەزای خودای گەورە لە یارانی‌و لە هاوڕێیانی‌و لە پەیڕەوانی، رەحمەت‌و سڵاوی خودا لە هەموو بەندە باشەکانی خودا، لەپاش ئەمە عەرزم هەیە:

**یەکەم/ پرسیار**: دەورو رۆڵی کاریگەری سوننەتی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لە هەموو بابەتە گرنگەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا چییە؟.

**وەڵام/یەکەم**: سەرچاوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام قورئانە، کە کەلام‌و فەرمایشتی خودای گەورە خۆیەتی.

**دووەم**/ سەرچاوەی ئەم ئایینە پیرۆزە سوننەتی پێغەمبەرە، کە ئەم چەند بەشەی هەیە: (قەولی‌و فیعلی‌و تەقریری‌و وەصفی) کەواتە: قورئان‌و سوننەت سەرچاوەی سەرەکی شەریعەتی ئیسلامن، واتە: قورئان‌و سوننەت تەواوکەری یەکترین، بەڵێ وەکوو فەرمووویانە: (لولا السنة لبقي القرآن بكراً!).

**سوننەت چییە؟** لە زانستی فەرموودەدا سوننەت بریتییە لە فەرموودەو کردارو رەفتارو بڕیارو ئاکاری پێغەمبەرو رەزابوونی لەسەر شتێ، حەدیسی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) کە بە کوردی پێی دەگوترێ: گوتارو فەرموودەو فەرمایشت – بەشی قەولییە لە سوننەت – واتە: ئەو بەشەیە: کە پێغەمبەری خودا بە قسەو گفتوگۆ فەرموویەتی، بەشی فیعلی ئەو کارو کردارانەیە: کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بە کردەوە کردوونی، بەشی تەقریری ئەو قسەو کارو شتانەیە: کە لە خزمەت حەزرەتدا

کراون، یان له هەر شوێنێکی تر کراون، یان باس کراون بۆ حەزرەتو حەزرەت ڕەزای لەسەریان بووەو ڕەخنەی لێ نەگرتوون، ئەم بەشانەیش تێکڕا لەو فەرمانو هەواڵو کاروبارانەی: کە پەیوەندییان هەیە بە ژیانی پێغەمبەرو بە ژیانی هاوڕێکانیەوە، کە قسە لە چۆنێتی پەخشو نەشری بەرنامەی ئیسلام دەکەن، لەسەرەتای دامەزرانیەوە هەتا کاتی سەقامگیربوونی.

سوننەت بە ئیعتیباری تریش ئەم سێ بەشەی هەیە: (حەدیس، خەبەر، ئەسەر) حەدیس: فەرموودەی پێغەمبەر خۆیەتی، خەبەر: هەواڵەکانی، ئەسەر: هەر شتێ، یان هەر فەرمایشتێ: کە هی هاوڕێکانی بێ، یان پەیوەندی بەوانەوە بێ، وە سەربەخۆ، یان ڕاستەوخۆ قسەی پێغەمبەر خۆی نەبێ.

**دووەم**: **تۆمارکردنی سوننەت**: سوننەت چۆن تۆمار کرا؟ وە کەی دەست کرا بە تۆمارکردنی؟ وە بە فەرمانی کێ تۆکار کرا؟ شێوەی تۆمار کردنەکەی چۆن بوو؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە بە کوورتیو پوختی ئەمەیە: لە کاتی ژیانی پڕ پیتو فەڕی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر تەوفیقو یاریدەی خودای گەورە، وە لەسەر فەرمانی خوا خۆیو بەپێی هاندانو فەرمانکردنی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرەبەرە بە شێنەیی، بەپێی حاڵو پێداویستی کاتو سات، دەست کرا بە تۆمارکردنی سوننەت، شان بەشانی لەبەرکردنو ڕەوانکردنو نووسینەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، هاوکات لەگەڵ ڕەورەوەی بۆ پێشەوە چوونی بەرنامەی ئیسلام.

**بەڵام لەسەر ئەم شێوەیە:**

حەقیقەتێ هەیە: کە کەم کەس لێی حاڵی دەبێ، بەڵام هەرکەسێ بە باشی لێی حاڵی ببێ دەزانێ: کە موعجیزەیەکی گەورەیە، ئەویش ئەوەیە تەرتیبی نزولی ئایەتو سورەتەکانی قورئان لەگەڵ تەرتیبی نووسینیان لە موصحەفدا زۆر زۆر لە یەك جیان، جا ئەم قورئانە ئەگەر تێکەڵاوی مۆخو

خوێنی پێغەمبەرو یارانی نەبوایە قەت قەت ئەم دوو تەرتیبەیان بۆ تەرتیب نەدەکرا، جارێ با بچینەوە سەر باسەکەی خۆمان.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر بە روونیو جوانیو شیرینی رۆژ بە رۆژ ئایەتەکانی قورئانی بە یارانی رەوان دەکرد، وە بایەخێکی زۆریان بە لەبەرکردنو بە ریزکردنی ئایەتەکان لەناو سورەتەکاندا دەدا، سورەتی وا هەبوو هەتا تەوواو دەبوو چەند جارێ شێوەی لەبەرکردنەکەی دەگۆڕا، چونکە ئایەتی نوێی لەناو دادەنرا، هەمیشە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەوڵی دەدا: کە یارانی زۆر بە باشی سوننەت لە کیتاب جیابکەنەوە، وە بایەخ بە هەردووولا بدەن، وە لەناویاندا قوراء زۆر بوون، لە هەمان کاتدا قورئان خۆی هانی گەلی ئیسلامی دەدا کە بایەخ بە سوننەتیش بدەنو سوننەت بە کەم نەزانن، وەك ئەوە فەرمووی: ﴿وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى ، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى – النجم/٣ – ٤﴾. هەروەها فەرمووی: ﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ – النحل/٤٤﴾. هاوکات لەگەڵ ئەم تەشویق کردنەدا لەسەر وەگرتنی سوننەت ناوی جوان جوانیشی لێ دەنا، وەك (الحكمة) و (الموعظة الحسنة) وە هەڕەشەی دەکرد لە بێ گوێی کردنی پێغەمبەرو پێی دەفەرموون: «مَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا» لە هەمان کاتدا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هانی یارانی خۆی دەدا: کە گرنگیو بایەخ بە فەرموودەکانی خۆی بدەنو لەبەریان بکەنو چین بە چین رایان بگەیەنن بە یەکتریو بە رەواننی لە یەکتری وەریان بگرن.

لە زۆر بۆنەو موناسەبەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی دەفەرموو: بە پێی حاڵو مەقام فەرموودەکانیان بە رەوانی لەبەر دەکرد، وە گەلێ جار دەیاننووسینەوە، بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا کارو

رەفتاریان پێ بکەن، ئەوەبوو کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانڕەوایەکی دەنارد بۆ شوێنێ، ئامۆژگاری دەکرد: کە حوکمڕانی لەسەر ئەم شێوەیە بکا:

یەکەم: بە کیتاب. دووەم: بە سوننەت. سێیەم: بە ئیجتیهادو کۆششی خۆی.

## چەند نموونەیێ لە فەرمانکردن بە بایەخدان بە سوننەت

خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) روو دەکاتە گەلی ئیسلام، لە هەموو کاتو شوێنێکاو پێیان دەفەرموێ: (خودای گەورە خۆشیو گەشی بخاتە دڵو دەروونو روخساری ئەو کەسە کە شتێ لە ئێمە دەبیستێ، وە چۆنی دەبیستێ ئاوا بەبێ زیادو کەم رەوانی دەکاو لە کاتی لە باردا رایدەگەیەنێ بە موسوڵمانان).

وە هەروەها پێیان دەفەرموێ: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ». جارێ لە کۆڕێکا خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) بڕێ فەرمایشتی بەرزی فەرموو، ئەبو شاه: کە سەرۆکی هۆزێکی گەورە بوو، عەرزی کرد: قوربان! بفەرموو: کە ئەم فەرمایشتانەم بۆ بنووسنەوە هەتا لەناو هۆزەکەمدا بیانکەم بە دەستوورنامە، حەزرەتیش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردو فەرمووی: (بیان نووسنەوە بۆ ئەبو شاه).

قوریش بە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصیان گوت (پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) هەر بەشەرە، هەموو جۆرە قسەیێ دەکا، مەرج نیە کە هەموو قسەکانی بە وەحی بێ، جا لەبەر ئەوە قسەکانی مەنووسەرەوە) عەبدوڵڵا ئەمەی عەرزی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) کرد، حەزرەت

(دروودی خودای لەسەر بێ) پەنجەی دانا لەسەر لێزی پیرۆزی خۆیو فەرمووی: (هەرچی لەم دەمەی من دەبیستی بینووسەرەوە، دەسا بەو کەسە: کە گیانی منی بە دەسە هەرچی هەق نەبێ لەم دەمە دەرناچێ!) یان وەك ئەوە ئیمامی بوخاری (رەزای خودای لێ بێ) لە ئیمامی ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە (دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو کاتێ فەرموودەیەکی لە بابەت شەریعەتەوە دەفەرموو، سێ جار دوپاتی دەکردەوە هەتا بە باشی تێی بگەنو بە جوانی رەوانی بکەنو وەری بگرن) زۆرجار دوعاو شتی وای وشە بە وشە بە یارانی لەبەر دەکرد، زۆربەی فەرمایشتەکاننیشی کورتو پوختو ڕەوانو ئاسانو پڕ مەعنا بوون، لە شێوەی قسەی نەستەقو پەندی پێشینان بەهێزو بە پێزو سەرنج راکێش بوونو بۆ لەبەر کردن زۆر خۆشو لەبار بوون، لە سیرەتو ژیاننامەدا باسی زۆر کەس لەو زاتانە تۆمارکراوە: کە فەرموودەی حەزرەتیان لە ژیانی خۆیدا نووسیوەتەوە، یان لەبەر کردووە، یان سەروەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بە نامە ناردوویەتی بۆ گەورە پیاوان، یان نووسیویەتەوە بۆ پیاوماقوڵانو سەرۆك هۆزەکانو بۆ میرو کاربەدەستەکانی ئیسلام، وە دەقی زۆر لەم نامەو کاغەزو نووسراوانە ماون، ئەمەیش ناوی چەند کەسێکە لەو زاتانە: کە حەدیسیان دەنووسییەوە: ئیمامی عەلیو ئیمامی ئەبو بەکرو عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصو سەعدی کوڕی عوبادەو عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفاو جابیری کوڕی عەبدوڵڵاو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ).

ئەمەیش ناوی چەند صەحیفەو کاغەزێکە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی، یا یاران نووسیویانە، دەقەکەی وەك خۆی، یان تەواوی

ناوەڕۆکەکەی ماوە: (الصحيفة الصَّادِقة) و (صحيفة أبي هريرة لهمام بن مُنبّه) و (كتاب عمرو بن حزم).

جا لەسەر تەوفیقی خودای داناو زانا، کە خۆی فەرموویەتی ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ – الأنعام/١٢٤﴾ بە تایبەتی لەپاش کۆچو هیجرەت، کە دەوری مەککی هاتە کۆتایی، وە دەوڵەتی ئیسلام لە مەدینەی نازدار دامەزرا، پێ بە پێو شان بە شانی پەخشو نەشرو حیفزی قورئان، پەخشو ڕەوان کردنو لەبەرکردنی سوننەتیش دەستی پێکرد، وە ئەم باسە لە سیرەتو ژین نامەی حەزرەتو یارانیدا زۆر بە جوانی روونکراوەتەوە، ئیتر لە هەموو قوناغێکا کۆمەڵێ زانای پایەبەرز لە یارانی پێغەمبەرو لە شوێنکەوتوانیو لە زانایانی گەلی ئیسلام، بایەخو گرنگییەکی چاکیان دەدا بە فەموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، پێغەمبەری خودا هەرچی فەرموو بوو لە بارەی پەیامو بەرنامەی ئیسلامەوە، خوا عەقایدو بیروباوەڕ بێ، خوا خواپەرستیو عیبادات بێ، خوا ئەحکام بێ، خوا عاداتو موعامەلات بێ، خوا داستانو پەندو ئامۆژگاری بێ، زۆر بە جوانی وەریان دەگرتو رەوانیان دەکردو لەبەرریان دەکردو لەکاتی پێویستدا دەیان نووسینەوە، لە هەمان کاتدا دەیانکرد بە دەستوورنامەی ژیانیان، هەتا لەسەردەمی سەحابەدا هەندێ لە سەحابەکان کە خۆیان تەرخان کردبوو بۆ لەبەرکردنی سوننەت، بە نۆرە دەچوون بۆ ئیشوکاری ڕۆژانەی خۆیان، یەکێکیان دەچوو بۆ ئیشوکاری ڕۆژانەی خۆیو ئەویتریان لە خزمەت پێغەمبەردا دەمایەوە، ئەگەر شتێ تازەی لە پێغەمبەر ببیستایە، لە ئایەتو لە حەدیس، خۆی ڕەوانی دەکردو لە دواییدا بە هاوەڵەکەیشی رەوانی دەکرد، وەك حەزرەتی عومەر وەهای دەکرد لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆیدا.

یاران هەیانبوو خزمەتی پێغەمبەری چۆڵ نەدەکرد، نەبادا حەدیسێکی لەکیس بچێ، یان لە فەیزو بەهرەو پیتو فەڕی دیداری بێ بەش بێ، وەك ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ).

لە ڕاستیدا لەسەر یاریدەو لە ژێر چاودێری خودا خۆیدا کۆمەڵێکی گەورە فەرموودەزانو سوننەتپەروەر پەیدا بوون کە بوون بە پارێزگارانی سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئیتر بەختەوەری هەرە گەورە ئەو کەسە بوو: کە زیاتر ئاگای لە سوننەتی پێغەمبەر بێ.

لە هەموو قۆناغەکاندا زۆر کەس لەم لایەنەوە مەشهوور بوون، لەسەردەمی سەحابەکاندا: ئیبنو عەبباسو ئیبنو عومەرو ئەبو هورەیرەو ئەبو موسای ئەشعەریو عائیشەو ئەبو زەڕی غەففاریو زۆر هاوڕێی تر مەشهوور بووبوونو بووبوون بە مامۆستای فەرموودەو فێرخواز لە دەوریان وەك هەنگ لە دەوری شاکەیان پوورەیان دابوو، لە ژیاندا کەس وەك حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) شارەزای سوننەت نەبوو، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، دەگێڕنەوە: کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە بە یارانی دەفەرموێ: «خذوا نصف دينكم عن هذه الحميراء».

**بە کورتیو پوختیو بە کوردی پەتی**: پاڵفتەی قسەی ڕاست لەم بارەیەوە ئەمەیە: ئیسلام نووری خودایە، خودای گەورە خۆی بەڵێنی داوە: کە سەری بخاتو لە فەوتان بیپارێزێو هۆی سەرکەوتنو پەخشەوەبوونو سەرگرتنو بەردەوام بوونی بۆ بسازێنێ، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ – الحجر/٩﴾ هەروا مژدەی تەواوکردنی ئەو نووره درەخشانەی داوە: کە دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ – الصف/٨﴾.

دەی دینێ: کە خوای گەورە خۆی خاوەنی بێ، کە خۆی ناوی بنێ نووری خۆی، کە خۆی خواستی لەسەر پەخش‌و راگەیاندن‌و تەواوکردنی بێ ئیتر چۆن هەموو هۆیەکی سەرگرتن‌و سەرکەوتنی بۆ نارەخسێنێ! (بەبێ شك‌و گومان کە ئیمدادی غەیبی‌و چاودێری خوایی، لە هەموو مەیدان‌و مەوداو گۆڕەپانێکا، خوا سەرباری بێ، خوا شارستانی‌و مەدەنی بێ، خوا وێژەیی‌و ئەدەبی بێ، لە هەموو کات‌و لە هەموو لایێ لەگەڵ نەتەوەی ئیسلام دایە).

سوێندم بە گەورەیی خوودا دەڵێی وا لەبەرچاوم: کە رۆحانییەتی پێغەمبەرو یارانی‌و حەزرەتی جوبرائیل‌و فریشتەکانی خودا، سەرومڕ رابەری‌و چاودێریی ئەم نەتەوەی ئیسلامە دەکەن، جا لەسەر ئەم بنیاتە لە قۆناغی یەکەما هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پیاوو ژن، لە ئازادو بەندە، لە عەرەب‌و لە عەجەم، هەرچی فەرمایشت‌و فەرموودەو هەواڵ‌و کاروبارو باسی چۆنێتی حاڵ‌و گوزەران‌و ژیانی پێغەمبەر بوو، وە هەرچی پەیوەندی بە پەیام‌و بەرنامەی ئیسلامەوە هەبوو، وردو درشتی، گەورەو بچوکی، ئەمانەیان هەموو رەوان دەکردو لەبەریان دەکردو لە کاتی پێویستدا سوودیان لێ وەردەگرت، گەلێ جاریش ئەم شتانەیان دەنووسییەوە وەك ئەبو بەکر زەکاتنامەی نووسی بۆ سەرکاری سەر زەکات لەسەردەمی خۆیدا، وە فەرمووی: ئەم دەستووره پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) نووسییەوە بۆ سەرکاری خۆی، دوا ئەوانیش چینی شوێنکەوتوان هەروا، کە مەشهووورن بە تابیعین، بگرە لەسەردەمی ئەماندا مەترسی تێکەڵبوونی قورئان لەگەڵ سوننەتدا نەما، لەبەر ئەوە بەرە بەرە گرنگی پێویست بە سوننەت دەدرا.

بەڵێ لەم قۆناغەدا موسوڵمانان زۆر بە دین بوون، بایەخی زۆریان بە مەعنەوییاتو بە رۆحانییەت دەدا، هێشتا لە ژێر تەئسیری نووری قورئانو ئاکاری کاریگەری چەرخی پڕ لە فەڕو نووری نوبووەتدا مابوون، بگرە دنیا پەرستی نەك هەر باوی نەمابوو لە ناویاندا، بەڵکوو شتی وا بوبوو بە عەیبو عاریش، خەڵك بە سروشت بەبێ تەکەللوفو تەسەننوع هەموو زاهیدو واریعو موتتەقیو موسوڵمانی پاك بوون، سەرجەمی موسوڵمانان هەموویان دڵ رووناكو ئیسلام دۆستو ئاشق بە قورئانو شەیدای سوننەتو سەربازی دڵسۆزی گیان لەسەر لەپی ئیسلام بوون، ئاواتی هەرە گەورەیان شەهید بوون بوو لە پێناوی ئیسلامدا، گەڵێ تاوان لەبەر ئەوەی لە کاتی ئەواندا رووی نەداوە، حوکمەکەی نەزانراوە لەسەردەمی ئەوانا وەك نوێژ نەکردن!

بەڵێ کۆمەڵگای ئیسلام زۆر پاكو پیرۆز بوو، سەرجەمی موسوڵمانان هەموویان دڵ رووناكو ئیسلام دۆستو ئاشق بە قورئانو شەیدای سوننەتو سەربازی دڵسۆزی قورئانو سوننەت بوون، لە راستیدا ڕەوانبێژی قورئانو بەهێزیی کەسایەتی پێغەمبەر خۆیو بەرزیو نایابی پەیامی ئیسلام شۆڕشێکی گەورەی وایان بەرپاکرد، کە کارەبا لەم چەرخی بیستەمەدا بەرپای نەکردبێ، لەم ناوچەیەدا کە دڵی جیهانی ئاوەدانی ئەو سەردەمە بوو شۆڕشی ئیسلام بوو بە مەشخەڵو تیشكو پرتەوی بە سەراسەری جیهاندا بڵاوبۆوەو ئاوی کردە ژێر هەموو رژێمە گەندەڵەکانی پێش خۆیو چرای دایە دەس هۆش کە بەرەی مرۆڤ لە خورافاتو بەندەیی غەیری خودا رزگار بکا، جا پۆل پۆلو گەل گەلو چین چین مەردوم دەهاتنە ناو نووری ئیسلامەوە، بەڕاستی ﴿جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ – الإسراء/٨١﴾ لەبەر ئەوە هۆی زۆر زۆر هەبوو بۆ بایەخ دان بە هەرچی پەیوەندی هەبێ بە پێغەمبەرو بە پەیامەکەیەوە، وە یەکێ لەم بوارە گرنگانە

حەدیس‌و سوونندت‌و تێکڕای شەریعەت بوو، کە بە ڕاستی بوارێکی فرە گەورەو فراوانە، دەریا ئاسایە، پڕە لە گەنج‌و جەواهیر! کوڕی دەوێ کە مەلەی تیادا بکا.

**سێیەم**: وردە وردە خەڵکەکە دەمردن‌و چینی نوێ دروست دەبوو، بەرەو دنیا مەیلیان تازە دەبۆوە، لە مەعنەویات‌و لە بەهرە گیانیەکان دوور دەکەوتنەوە، خەریك بوو کەسانی وا لەناو ریزی موسوڵمانانددا پەیدا ببن کە بە دیمەن‌و رواڵەت لە زانا بکەن، بەڵام لە راستیدا رەشە خەڵك بوون، چونکە لێکۆڵینەوەو تەحقیقێ کە لایەق بە عالم بێ لە بواری سوننەتدا، وە لە بابەتە ئیسلامییەکانی تردا، بەو کۆڵکە زانایانە نەدەکرا، ئەم دیاردەیە تازمیەیش هۆی جیاجیای زۆر بوو، وەك پەیدابوونی تەحزوب‌و تەشەییوع‌و تەمەزهوب‌و شتی تری لەم بابەتە، کە ئەم کورتە باسە شوێنی ئەو وردەکارییە نیە، کەمتەرخەمیش لەم بارەیەوە لێرەو لەوێ سەری هەڵدا، ئەم حاڵەتەیش لەپاش تەواوبوونی چینی دووەمی موسوڵمانان رووی دا، کە پێیان دەگوترێ: (شوێنکەوتوان، واتە: تابیعین).

بەڵام لە سایەی خوداوە ئەمە بوو بە مایەی خێرێکی گەلێ گەورە بۆ گەلی ئیسلام، چونکە لەم کاتەدا سوپایەکی گەورە لە زانای گەورە گەورە لە گۆڕەپانی راگەیاندنی پەیامی ئیسلامدا ئامادەبوون، وە ئەم دیاردە نوێیە کە وەك زەنگی هۆشیارکردنەوە وابوو، ئەو زانا گەورانەی بێدار کردەوە، کە هەتا زووەو دەرفەت ماوەو هەل لە کیس نەچووە خۆکەون‌و فریاکەون!

زانای غەیرە عەرەب لەم کارەداو لەم کاتەدا رۆڵێکی سەرەکییان هەبوو، دەورێکی کاریگەری یەکالاکەریان بینی، چونکە پسپۆڕی پتریان هەبوو لە بارەی تەدوین‌و تۆمارکردنی شەریعەت‌و دیانەت‌و نووسینی مێژووو شانامەو داستان‌و چیرۆکی پاڵەوانان‌و شتی واوە، بە تایبەتی زاناکانی وڵاتی فارس‌و شام‌و میصرو

عێـراق، ئـیتر ئـەوەبوو زاناكـان لەسـەر شـێوەیەكی زانـستانە، بـە چەشـنێكی ڕێك‌وپێـك، دوور لـە شـێوەی هەقایـەتخوانیو ئەفـسانەو داسـتانە پـڕ ئەفـسوونە كۆنەكان، گشت سوننەتی پێغەمبەریان كۆكردەوەو بە جوانی بۆڵ بژێریان كردو كاكڵەكـەیان تۆمـار كـردو كـاو كۆتـەڵو بـن بێـژنگ‌و سـەركۆزەرەكەیان لـە دەوروبەری ئەو خەرمانە پـڕ پیـتو فـەڕە خـڕ هەڵدا، هـەتا خاكەڕۆكـەر بەشـی خۆی لێ هەڵگرێنێ!

وە بەم كارەیان شوورایەكی چاكیان بۆ قەڵای قایمی سوننەتی پێغەمبـەر كرد، بۆ یەكەمجار لە مێژوودا حەقیقەت وەك خۆی نووسراو ئەفسانەو پەسنی درۆی تێكـەڵ نـەكرا هـەتا گـوڵو گـوڵزارو گوڵـشەنی ئـایینی پـیرۆزی ئیـسلام دووچاری دڕك‌و داڵو بـژارو گـژوگیای لاوەكـی نـەبێ، گەرچـی كەمـە كەمـە زانـا نۆموسـوڵمانەكان بـە تایبـەتی لـە خـاوەن نامـەكان، دەروازەیـەكیان بـۆ سـەر هەڕەمـەی ئیـسرائیلیات كـردەوە، كـە وەك مزەئـاش لـە هـەموو جۆرێكیـان تیـا كۆكراوەتەوە، جا لە ئەنجامی ئەم بارودۆخە تازەیەدا شۆڕشێكی ویقائی نوێخواز رووی دا، زۆر بــە لێزانانــە كـۆنو نــوێ دەق وەك ڕەنگــەكانی پەلكەزێڕینــە سەرجەمەكانیان ئاوێتەی یەكتر دەكران، ئیتر بە سەدانو بە هەزاران تاك تاك‌و پۆل پۆل زاناو مەلاو فەقێو مامۆستا، لە هەرچوار لای جیهانی ئیـسلامەوە وەك سـەربازی فیـداكاری دڵـسۆزی دلگـەرم، هەڵڕژانـە نـاو ئـەم مەیدانـەوە، چـاكی مەردایـەتییان لێ كـرد بـەلاداو، بـە دەیـانو بـە سـەدانو بـە هـەزاران گەشـت‌و سـەفەرو كـۆڕو دیمانـەو چـاوپێكەوتنو مەجلیـسیان سـازداو، بـە ملیۆنـەها كیلۆمـەتر سـەفەریان كـرد، تـەنیا بەشـوێن كۆكردنـەوەی سـوننەتی صـەحیحی پێغەمبەردا، ساخ لەبەر ڕەزای خودا، نەوەك لەبـەر مەبەسـتانی جیهـانی، خـەوو خۆراك‌و وچانیان لـە خۆیـان هەراسان كـرد، هـەتا سـەرەنجام بـە ئـاواتی خۆیـان

گەیشتن‌و لەسەر یاریدەی خوایی خەرمانی پڕ پیت‌و فەڕی سوننەتیان زۆر بە جوانی کۆکردەوەو لەسەر چەند شێوەیەکی ڕێك‌وپێك تۆماریان کرد، کە یەکێ لەو شێوانە شێوەی نووسینەوە بوو، لەگەڵ لەبەر کردندا.

**چوارەم**: جا لەم قۆناغەدا عیلمی ریوایەت‌و زانستی گێڕانەوەو تەدوینی سوننەت‌و تەسجیلی حەوادیس‌و تۆمارکردنی زانست‌و هەواڵ‌و ژیاننامەی گەورە پیاوان‌و شیکردنەوەی حاڵی کەسانێ: کە هەڵگری زانست‌و پەیامی شەریعەت بوون، ئەمانە هەموو بوون بە زانستێکی گەورەی فرە لقی بەرجەستەو بوون بە هونەرێکی گرنگی بایەخداری سەرربەخۆ، لەم قۆناغەدا گشت راوی‌و فەرموودەزانێ پێناسەو هەوێیەکی تێروتەسەلی بۆ کرا، لە هەموو لایەکەوە ژیانی خرایە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوە، وەك ئەوە خەڵکی کوێیە، ناوی چییە، راستگۆیە، هەقانییە، زمین رۆشنە.....تاد.

لە هەمان کاتدا هەموو حەدیسێ پیناسەیەکی بۆ دروست کرا، وە بە خۆی‌و گشت وەجهو توروقەکانیەوە کیانێکی بۆ دروست کرا، واتە هەر حەدیسێکت دەگرت، یان هەر راوییەکت دەگرت مەعلوماتێکی زۆر زۆر لە بارەیەوە کۆکرابۆوە، رای گەورە پیاوانی فەرموودە لە بارەیانەوە تۆمار کرابوو، ئەمەیش دەریایەکی گەورەیە وا بە ئاسانی باس ناکرێ، ئەوەندە هەبووە لە عەصری سەحابەو تابیعیندا گرنگی‌و بایەخ لە پلەی یەکەما هەر بە دەق‌و مەتنی فەرموودەکە دەدرا، چونکە لەم دوو سەردەمەدا کێشەی (راوی) نەبوو، یان زۆر زۆر کەم بوو، چینی سەحابە هەموویان‌و چینی تابیعین زۆربەیان هەموو مەرجێکی شایەتیدانی شەرعییان تیادا هەبوو، چوونکە گشتیان راست‌و دروست‌و لەخوا ترس‌و زاناو دانا بوون، بەهیچ جۆر مەترسی ئەوەیان لێ نەدەکرا کە تەبدیل‌و تەحریف‌و گۆڕانکاری‌و دەستکاری لە ئاییندا بەرپا بکەن،

ئەگەر لە خۆری نیوەڕۆ چاوەڕوانی تاریکی بکرێ لەوان چاوەڕوانی خیانەت لە ئەمانەتی تەبلیغی ئیسلام ناکرێ.

لەخوا بەزیاد بێ دووپاتی دەکەینەوە کە عینایەی ئیلاهی سەرچاوەی هەموو ئەو هەوڵو کۆششە پیرۆزانەیە: کە بە درێژایی مێژووی ئیسلام بوون بە مایەی پیرۆزی پەیامی ئیسلام، وە ئومێد دەکەین کە ئەم چاودێرییە خودایییە هەتا ڕۆژی قیامەت بەردەوام بێ، بە تایبەت لەکاتی سەخڵەتیو تەنگانەدا، گەرچی گومان لەوەدا نیە کە عەمەل بە زاهری أسباب ڕۆڵی خۆی دەبینێ، لەبەر ئەوە ئێمە گلەییمان هەیە لە کەسانێ: کە هەموو هۆی سەرکەوتنێ دەگێڕنەوە بۆ عەمەل بە سەبەبی زاهر، شتی وا هەڵەیە، ئیمدادی غەیبیو عینایەت خوایی نەصصی قورئانە، ئینکاری جەهلە.

بۆ نموونە عیلمی تەجوید وردەکارییەکی عەجایەبی وەهای تیادایە، ئەگەر یاریدەی خوایی نەبوایە قەت ئەو هەمکە مەسائیلو بابەتە وردە پڕ گشت هونەرە بەرزە، لەسەر دەستی کەسانێکا: کە لەو سەردەمەدا زۆر بێ ئاگا بوون، لە (عیلمی ئەصوات) و لە (مەخاریجی حوروفو صیفاتی) نەدەهاتە دی، جا بەبێ گومان کە تۆمارکردنی سوننەتیش لەم (عینایەی خوای)یە بێ بەش نەبوو، بەڵکوو بەشی گەورەی پێوە بوو، لە ڕاستیدا مێژووی ئیسلام دەیسەلمێنێ: کە هەمیشە دەستی ئیمدادی غەیبی، لە پشت پەردەی غەیبەوە ڕۆڵی کاریگەری بووە لە گشت پیرۆزییەکانی ئیسلامدا.

**پێنجەم**: جا لە هەلو مەرجێکی ئاوادا خودای گەورەو مەزن بە ڕەحمەتی خۆی کۆمەڵێ زانای خاوەن تەقوای شارەزای پسپۆڕی کارامەی چابوکی چالاکی ڕەخساند، کە بە ڕاستی ئاشقی سوننەتی پێغەمبەر بوون، هەیان بوو سەد هەزار حەدیسی زیاتر لەبەر بوو، ئاگای لە مێژووی ژیانی یەك بە یەکی





ئەو پیاوانە بوو: کە ناویان لەناو رشتەی ئەو حەمکە فەرموودانەدا هاتبوو! خودی رشتەکان بوبوون بە هونەرێکی سەربەخۆ، هەموو راوییەك خۆیو شێخیو خۆیو فەقێی لە سەنگی مەحەك دەدران، رشتەی زێرین ئەو ڕشتانە بوون: کە یەك بە یەکی راویەکانی پیاوی ناوداری زانای دانا بوون، وەك زوهری لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە لە عائیشەوە، وەك مالیك لە زوهرییەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وەك مالیك لە نافیعەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە، نەیسە گەڵێ جار زانیاری پێویست سەبارەت بە پیاوانی رشتەی فەرموودە گەڵێ زیاترە لە زانیاری پێویست سەبارەت بە دەق (مەتن)ی فەرموودەکە، شتی وایش هەر بە دەم خۆشە زۆربەی موسوڵمانان لەم چەرخەی ئێمەدا بە دەست لەبەر کردنی سورەتی فاتیحەوە داماون! کەچی کۆلکی وا پەیدا بووە خۆی بە عەسقەلانیو ذەهەبی ناگۆڕێتەوە، وەك خوێنەوارە رەمەکییەکان قسەی ڕۆژنامەو گۆڤارو ئێسگەکان دەکا بە حوججەت لەسەر حەدیسی صەحیح!

بەڵێ پێناسەیەکی کورت بۆ ئەم کۆمەڵە پیرۆزە ئەمەیە: ئەم زاتانە هەموو لەخوا ترس بوون، هەموو زاناو داناو بێ هەواو سەلارو سەنگینو هێمن بوون، شەیتان شەرمی لێ دەکردن، هەموو زیرەكو هۆشیارو زرنگو زەین روون بوون، هەموو راستو دروستو راستاڵو راستگۆ بوون، شەیدای شەریعەتی خودا بوون، بە موو لە شەریعەت لایان نەدەدا، هەموو تەوێڵ نوورانی، چارە چارەی زانای رەببانی، دڵ روونالك، نیاز پاك، سروشت چاك، بەرچاو روون، هێمنو بێوەی، دوور لە شەڕو شۆڕو دەبدەبەی، وەك کۆتری بێومیی ناو حەرەم وابوون!

هەموو تەمەنی خۆیان لە رێگەی خزمەت کردنی دیندا سەرف دەکرد، زۆربەی ژیانیان لە خزمەتی قورئانو لە سێبەری مزگەوتو لە گۆشەی

قوتابخانـه ئیـسلامییەکاندا دەبـردە سـەر، بـەرگی بـەڕێزی زانایانیـان دەپۆشـی، مێـزەر تـاجی سـەریان بـوو، مەنـدیلی سـپی بـێ گـەرد نیـشانەی دڵـی رونـاك‌و دەروونـی پـاکی بـێ گـەردیان بـوو، لەسـەربەرزی‌و سـەلاریدا وێنـەی چـیا سـەر بـەرزەکانی کوردسـتان وابـوون، کـە بـەفر لـە بـەهارانا لوتکـەکانیان دادەپۆشـێ، هەموو خاوەن ریش‌و سیواك‌و بەرماڵ‌و سیمای پیاو چاکان بوون، تـەوێڵیان وەك جێ تەمغە شوێنەواری سەجدەی پێوە دەدرەوشایەوە، زیکرو یـادی خـوا پیـشەی هەمیشەیان بوون، زماننیان هەموو کاتێ بە یادی خودا تەڕو پاراو بـوو، بـە ڕۆژ سوارچـاکی مەیـدان‌و بـە شـەو سـۆفیلکەی سـەر بـەرماڵ بـوون، بـە واتـای وشـە پەروەردەی ناو مزگەوت‌و مینبەرو میحراب بـوون، هـەموو زمـان پـاك، سروشـت پـاك، شـێوە شـیرین، روخـسار نـوورین، بـە هـیچ جۆرێـك تێکـەڵاوی کـۆڕی دونیاپەرسـتان نـەدەبوون، بـە هاوڕێیـەتی پیـاوی خـراپ تەنگەنەفـەس دەبـوون، هەناسەیان بۆ موسوڵمانان شـیفا بـوو، بـە راسـتی دەتگـوت: پۆلـە پەپوولـەی نـاو گـوڵ‌و گـوڵزارن، یـان پۆلـە فریـشتەی نـاو بەهەشـتی بـەرینن! سـەد سـاڵ لـە خزمەتیاندا دابنیشتیتایە نە درۆیەکت لێ دەبیستن، نە غەیبـەتێ، نـە بوختانـێ، نە قسەیەکی بێ شەرعی نە کارێکی ناڕەوا، نە کـارێکی پێـچەوانەی سـوننەتت لێ دەبینین.

بگرە قسەی بێ سودیشت لێ نەدەبیستن، نووری ئیمـان‌و نـووری قورئـان‌و نـووری سـوننەت‌و نـووری عـیلم‌و نـووری تـەقوا، وا دڵ‌و دەروون‌و چـاوی رۆشـن کردبوونـەوە وا هەسـت‌و هۆشـی روونـاك کردبوونـەوە دەتگـوت: هـەموو کاتـێ دۆزەخ‌و بەهەشت وا لەبەر چاویان، هەیان بوو لە خەویشدا لە خوا غافڵ نەبوو، هەیان بوو لە خەودا پرسیاری لە خودا دەکرد.

دەگێڕنەوە ئیمامی ئەحمەد (ڕەزای خودای لێ بێ) لە خەوندا عەرزی خودا دەکا: کە چی شتێ زۆر باش بەندە لە خودای خۆی نزیک دەکاتەوە، دەفەرموێ: خوێندن‌و دەورکردنەوەی قورئان با لە مەعناکەشی تێ نەگا.

کە ناوی خۆشەویستیان دەهێنا (دروودی خودای لەسەر بێ) موچوڕکە بە لەشیانا دەهات ڕەنگیان دەگۆڕا، فرمێسك لە چاویان دەباری، ناخیان وەك شۆڕە بی دەهەژا، هەموو خاوەنی مەقام‌و جێگەو کۆڕی زانست‌و خاوەنی مەجلیس‌و کۆڕی پەخشی زانست بوون، گەرچی لە ماڵ‌و سامانا زۆرتر هەژار بوون، بەڵام بە دڵ دەوڵەمەند بوون، مەشرەب سەخی بوون، پارووی‌ەك نانیان ببوایە لەگەڵ فەقێ‌و میوان‌و هەژاراندا دەیان خوارد، بە دەیان‌و بە سەدان فەقێ‌و زاناو فێرخواز لە ئەڵقەی تەدریسیاندا بەهرەمەند دەبوون، هەتا میرو فەرمانڕەواکانیش وەك خەڵکاتی تر ئامادەی کۆڕی زانستیان دەبوون‌و سودو بەهرەیان لە عیلم‌و زانستیان وەردەگرت‌و لە خزمەتیاندا بە چۆکدا دەهاتن، بەڵام خوا نەکا ئەوان بەوە بە قەد زەڕەیێ لە خۆیان بایی ببن، یان مەیلی دنیایان تازە ببێتەوە، خۆشەویستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا دڵی غەزاکردبوون، جێگەی خۆشەویستی پڕوپیتی دونیای تیادا نەدەبۆوە! کەم کەس لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا لەم حاڵە تێ دەگا، یان باوەڕی پێ دەکا، مەگەر کەسێ ماوەیێ لە خزمەت فەقێ‌و صۆفی‌یەکانی بیارەدا بوبێ، لەسەردەمی شێخ عەلائەددین‌و مامۆستا مەلا عەبدولکەریما، خوا سەربەرزی دین‌و دونیایان بفەرموێ.

بەڵێ هەرکەسێ لەسەر ئەم شێوە پەسەندە نەبووبێ، خاوەنی ئاوا تۆمارگەیەکی پاك‌و پیرۆز نەبووبێ، قەت قەت پێشەوایانی حەدیس فەرموودەیان لێ وەرنەگرتووە!

بەڵکوو بەبێ شكو گومان کە چاودێری نهێنی خوایی، ڕێگەی سەرگرتنی شتی وای نەداوە، بگرە هەمیشە ڕابەریی خواییو دەستگیرۆدەیی یەزدانی، ڕۆڵێکی گەورەی بووە لە نەخشەکێشانو سەرپەرشتی کردنی پەروەردەو پێگەیاندنی نەتەوەی ئیسلاما، بە تایبەت لە گۆڕەپانی زانستەکانی قورئانو سوننەتدا، وەك خۆشەویست خۆی (درودی خودای لەسەر بێ) ئاماژە بۆ ئەم چاودێریە خوداییو ئیمدادە غەیبییە دەکا، لە مەسەلەی خەلافەتی ئەبو بەکری صەدیقداو ئاماژە بۆ ئەوە دەکا ئەگەر کەسێ لەسەر جێنشینی گەڕ بە ئەبو بەکر (ڕەزای خودای لێ بێ) بکا، نە خوا ئەوە دەکاتو نە موسوڵمانانیش شتی وا قەبووڵ دەکەن، بە دەق دەفەرموێ: «وَيَأْبَى اللّٰهُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلاَّ أَبَا بَكْرٍ».

سەرنج بەفەرموون: ئیمامی بوخاری (ڕەزای خودای لێ بێ) بە شازدە ساڵ صەحیحی بوخاری داناوە، گەشتێکی گەورەی بۆ ئەم مەبەستە ئەنجام داوە، قەبوڵی غەریبیو ئاوارەییو توونێتیو برسێتیو خەتەری ڕێگەوبانی پڕ خەتەرو مەترسی کردووە، بە هەزاران میل ڕێگەی بڕیوە، سەرماو گەرمای زۆری چەشتووە، بە سەدان شاری گەورە چووە، بە هەزاران گوندو دێو شارۆچکە گەڕاوە، بە خزمەت هەزاران مامۆستاو ڕاویو محەدیسو زانا گەیشتووە، بە هەزاران کۆڕی زانستی بەستووە، هەموو جارێکیش لەپاش پەیجوورو لێکۆڵینەوەیەکی زۆرو کۆششێکی باش کاتێ حەدیسێکی بە دڵی خۆی دەست دەکەوت، کە دەقەکەی بێ گەرد بێو ڕشتەکەی بێ نەنگ بێ، دەستنوێژێکی جوانی دەگرت، غوسڵێکی سونەتی دەکرد، ئەوجا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی شوکری خوای لەسەر ئەم بەهرە گەورەیە دەکرد، کە ئەو فەرموودەیەی دەست کەوتووە، ئەوجا فەرموودەکەی لەبەر دەکردو لەناو

بوخاری شەریفدا دەینووسیەوە! وەك گەنجی گەوهەری دۆزیبێتەوە ئاوا، بگرە پتریش!

**بەبێ گومان کە لەم ماوەیشدا ئەمە چمکێ لە حاڵی بووە:**

١- لەو ماوەیەدا زیاتر لە پێنج حەجی کردووە، چونکە پێنج ساڵیان لە بەصرە بووە هەر پێنج ساڵەکە حەجۆ عەمرەی کردووە.

٢- هەموو شەوێ شەونوێژی باشی کردووە.

٣- هەموو مانگێ بەلایەنی کەمەوە خەتمێی قورئانی کردووە.

٤- پارووی حەرام نەچۆتە دیوی دەروونی.

٥- یەك نوێژی سوننەتی ڕۆژانەی نەفەوتاوە.

٦- تەتەببوعی هەموو سوننەتێکی پێغەمبەری لە هەموو بابەتێ کردووە، بەبێ مەهانەی ڕەوا نەیفەوتاندوون.

٧- ڕۆژوویەکی سوونەتی زۆری گرتووە.

٨- گوناهی گەورەی لێ صادر نەبووە، صەغیرەیش مەگەر چۆنەهاو زۆر بچووك بووبێو پێی نەزانی بووبێ.

٩- دەرسێکی زۆری بە فەقێکانی گوتووە.

١٠- زۆریش سەخی بووە، لە خێرو حەسەنات بەپێی توانا درێغی نەکردووە.

١١- هەتا تەصەوورەکەی زاهیدو بێ هەواو خاکیو خاوەن تەقواو دوور لە شتی پڕوپووچو بیدعەتکاری بووە.

١٢- ئەوەندە ئیعتیمادی کوللی لەسەر حەدیس بووە، مەزهەبی مەعرووفی نەبووە.

١٣- بێجگە لە ڕەزای خواو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەم کۆششە پیرۆزەدا مەبەستی تری نەبووە، گوێی بە دونیا نەداوە، لە کێشەو بەرەو مەشاکیلیشی خاڵی نەبووە.

١٤- گوزەرانێکی سادەی هەبووە، بە نان‌و ئاو هەڵی کردووە.

١٥- لەپێش تەمەنی دە ساڵیدا دەستی کردووە بە حەدیس لەبەر کردن.

١٦- سەد هەزار حەدیسی صەحیحی لەبەر بووە.

١٧- کورت‌و پوخت باشترین پێناسە بۆ بوخاری ئەمەیە من عەرزتانی دەکەم: (كان خلقه صحيح البخاري).

١٨- بەسە بۆ بەیانی فەزڵ‌و گەورەیی بوخاری، ئیمامی موسلیم: کە دەچێتە خزمەتی ناوچاوانی ماچ دەکاو پێی دەفەرموێ: (ڕێگەم بدە با هەردوو قاچەکانت ماچ بکەم ئەی مامۆستای مامۆستایان! ئەی سەرورەی هەموو فەرموودە شوناسەکان).

ئەمە حاڵی شەخصی خۆی بووە، لە بارەی گرنگی دان بە کتێبەکەیشی ئەم چەند خاڵە ڕوون دەکەینەوە:

١- ئیمامی بوخاری (ڕەزای خودای لێ بێ) لە هەموو کەسێکی تر باشتر ئاگای لە مەتنی حەدیسەکانی صەحیحەکەی‌و لە حاڵی پیاوانی ڕشتەکانیان بووەو شارەزایی تەواوی لە گشت وەجەو تەریقەکانیان بووە.

٢- بوخاری لە زانستی (جەرح‌و تەعدیل)داو لە (شروطی صحەتی حەدیس)دا مامۆستای مامۆستایان بووە، کەس بە قەد ئەو لەم بوارەدا نە ئەوەندە شارەزاو پسپۆڕ بووە، نە ئەوەندە (متشدد) بووە، نە ئەوەندەیش سەرکەوتوو بووە نە ئەوەندەیش بە پەرۆش بووە بۆ خزمەتی حەدیس.

٣- بەبێ شك وەك دارای عیلمی زاهیر بووە دارای عیلمی باتنیش بووە، واتە: صەفای رۆحی بۆ پەیدا بووە، گەیشتۆتە دەرەجەی یەقین‌و پلەی گومان نەمان، یەكێك بووە لە (ملهمون) و (محدثون)ی ئوممەت، كە حەزرەت خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) مژدەی پەیدابوونی ئەوانی داوە: كە یەكێ لەوان لەسەردەمی حەزرەت خۆیدا ئیمامی عومەر بووە (رەزای خودای لێ بێ).

بوخاری بە خەون زۆر بە خزمەت حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشتووە، بەهرەی لەو خەونانە وەرگرتووە، دیتنی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لە خەوندا بەوە ناگوترێ: كە هەندێ كەس لە خەوندا تارماییەك دەبینێ، دیتنی خۆشەویست لە خەوندا بەهرەیەكی زۆر گەورەیە، حەدیسی صەحیح لە بارەیەوە هەیە، ئەهلی سوننەت بە ئیجماع، بە یەك دەنگ بوخارییان خۆش دەوێ‌و بە ئیمامی خۆیانی دەزانن، بە گەورەترین زانای فەرموودەزانی دادەنێن، مەلای گەورەی چاكم بەچاوی خۆم دیوە لە خزمەت صەحیحی بوخاریدا رانەدەكشا، دەنگی بەرز نەدەكردەوە، كتێبی تری لەسەر دانەدەنا.

مەبەست لە عیلمی باتن ئەو مەلەكە نهێنییەیە: كە لە ئەسەری تەقوای زۆرەوە بۆ دڵ پەیدا دەبێ، بەرچاوی روون دەبێتەوە، بە فیراسەی ئیمانی هەست بە دروستی‌و نادروستی شت دەكا، زۆرجار دڵی خەبەر دەدا، ئازایزان! بزانن: (إن القلوب في قبضة الرحمن يقلبها كيف يشاء!). ئەبو داود (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: عیمرانی كوڕی حوصەین فریشتە دەهاتن بۆ دیدەنی‌و سڵاویان لێ دەكردو بە گوێی خۆی سڵاوەكەیانی دەبیست (تاج – ٤ ل - ١٩٧).

لە حەدیسێكی درێژی موسلیمدا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەو كەسەی: كە گیانی منی بە دەستە ئەگەر دەوام بكەن

لەسەر ئەو حاڵی دلگەرمی‌یەی: کە لەلای من هەتانە، وە بەردەوام سەرگەرمی یادو زیکری خودا بن، پەردە لەنێوانی ئێوەو فریشتەکاندا هەڵ دەگیرێ، ئیتر لە هەموو جێیێ تەنانەت لەسەر نوێن‌و لە رێگەو بانیش فریشتەکان چاك‌وچۆنی‌و تەوقەیان لەگەڵتان دەکرد!) (ریاج الصالحین/ ١ ل - ١٧٧).

وەکی تریش بەسە بۆ قەدرو رێزی ئیمامی بوخاری: کە شاگوڵی ناو شاکارەکانی: کە صەحیحی بوخاری‌یە، دووەم کتێبی موقەدەس‌و پیرۆزە لە ئیسلامدا، یەکەم قورئانی پیرۆز، دووەم بوخاری شەریفە، سێیەم صەحیحی موسلیمە، کەچی بە داخەوە دەڵێین: (ئێستا کەسانێ وا پەیدا بوون، گەرچی زۆر دڵسۆزن بۆ ئیسلام، وە هەتا بڵێی نیازیان پاکە وە زۆر زۆر خێری ئیسلامیان دەوێ، بەڵام – لە ژێر تەئسیری ژەهری کوشندەی راوبۆچوونی خۆرهەڵاتناس‌و موستەشریق‌و عیلمانیەکاندا – رەخنە لە سەرچاوە گرنگەکانی سوننەت دەگرن، قسە ژەهراوییەکانی سەلامە مووساو طاها حوسەین‌و ئەحمەد ئەمین دەجوونەوە، کە ئەوانیش قسەی عیلمانییەکانی دژ بە ئیسلام کاوێژ دەکەنەوە، بەندە بۆ خودا عەرزی ئەم ئازیزانەی خۆم دەکەم: (ئیسلام کوللی لا یەتەجەززەئە، موداراى ئەهلی ئەهوا لەسەر حیسابی قورئان‌و صەحیحی سوننەت دەق ئەمەیە: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ – البقرة/٨٥﴾. وەکی تریش ﴿قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ – آل عمران/١١٨﴾ نەتیجەیش ئەمەیە: کە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ – البقرة/١٢٠﴾ ئێمە قسەمان لەوەیە کە پەلاماردانی سوننەت لەسەر ئەم شێوە شێواوەی ئێستا خزمەتی دوژمنانی ئیسلام دەکا، دەنا لاریمان لە رەخنەو بۆچوون‌و هەڵسەنگاندنەکانی عەسقەلانی‌و زەهەبی‌و نەوەوی‌و ئیبنو صەلاحی شەهرەزوی نیە، ئێمە بۆ

نموونــه دەڵـێین: ئـەم زاتانــە ئێـستا جـەماوەر تــەفرە دەدەن و سـەر لـە نیمـچە خوێنەوارەکان دەشـێوێنن، سـەلبی سـیقە لـە صـیحاحی سـوننەت دەکـەن، جـارێ لاوێ لێی پرسـیم: فلانـە سیلسیلەت دیـوە؟ گوتم: نـا، تـۆ کـە دیوتـە چـی لێ تـێ دەگەی؟ یەکسەر گوتی: زەعزەعەی سیقە بە صەحیحی بوخاری دەکا! جا باشـە توخوا دوژمنیش کاری وا دەکا؟! هەیانـە وەك جـەدوەلی زەرب جـەدوەل و خـشتە بۆ حەدیسی صەحیح و حەدیسی زەعیف دادەنێن، ڕێـز لـە صـەحیحی بوخـاری و صەیحی موسلیم و صیحاحەکانی تری سوننەت دەگرن و بە قەڵەم خشکەیێ، وەك مامۆسـتایێ دەفتـەری منـاڵ تەصـحیح بکـا، ئـاوا نیـشانەی ( ✓ ) راسـت، یـان نیشانەی (X) هەڵە بۆ فەرموودەکانی صەحیحی بوخاری و صەحیحی موسلیم و ریاض الصالحين دادەنێن! بە چاوی خۆم نووسراوێکم دی ژمارەی بۆ دانرابوو لـە یەکێتی قوتابیانی لایەنێکەوە بە ڕەسمی دەرچووبوو، ئەمەی تیابوو: (بڕیارمـان دا فلانە حەدیس صەحیحە!).

بـە ڕاسـتی شـتی وا، لـەلای کەسـێ: کـە لـە حاڵەکـە حـاڵی بـێ کارەسـاتە، موسیبەتە، خەرقە لە دیندا، هێنانە دیی ئاواتی دوژمنانی ئیسلامە، لـە مێـژەوە دوژمنەکانی ئیسلام – بە تایبـەتی گـرۆی رافیـزە، کـە زۆربـەی صـەحابەکان بـە مونافیق دادەنێن – خەو بە شتی واوە دەبیـنن و خـوا خوایانـە کـە کەسـێ تاقـە وشەیێ لەم بارەیەوە بڵێ ئەوان لە گیرفانی خۆیانەوە هەزار و یەك درۆی تـری لێ زیاد بکەن.

ئێستا ئەگەر سەلامە مووساو طاها حوسەین و ئەحمەد ئەمین بمانایە، بە هەرچوار پەل چـەپڵەیان بـۆ ئەمانـە لێدەداو دەیـانگوت: ئـای نـەمانگوت؟! ئـەوا کـاتی ئـەوە هـاتووە: کـە کتێبـی (في الـشعر الجـاهلي) زەهـری هـەلای هـەلی خـۆی بڕێژێ، گوێ قولاخ بن هاکا سەرەی پیاداچوونەوەی قورئانیش هات! ئازیزان: بـە

قوربانتـان بم، حـەديس وا تـەحقيق نـاكرێ، ئەمـە خـەرقێكى ناحەقـە، دەبـێ بەهۆی هەڵوەشانەوەی بەردی بناغەی ئیسلام پەنا بەخوا لە شتی وا.

لـە هـەمووی سـەيرتر ئەمەيـە هـەر نيمـچە خوێنـدەوارێ دەگـرێ، لیستەیەکی پێیە بەناوی سیلسیلەی صەحیحەی، یان سیلسیلەی مەوزوعەی ئـەم فلانو ئەو فلانەوە، بە ئارەزووی خۆی — وەك يانسيبی بۆ دەرچووبێ — حـوكم دەكا بە صيحجەتو وەزعی حەدیس!.

موصيبەتەكە گەيشتۆتە رادەيەكی وا هەر لاوێكی كەم ئەزموون دەبينـی، خـۆی بـە (محـدث) و (مـصحح)و بـە فـەرموودەزان دەزانـێ، كاتـێ باسـی فيقـەو شەرع دێتە پێشەوە دەڵێ: (هەر مەسەلەیێ حەدیسی لەسـەر نـەبێ بـاوەڕم پێـی نیە!) کاتێ باسی سوننەتیش دێتە پێشەوە ئەو زاتـە سيلسيلەيێ دەردێنـێ، وەك ئیجازەی مارو دوپشك دەڵێ: ئەمـە زەعیفـەو ئـەوە مەوزوعـەو ئـەم مەسـەلەیە فیقهیـە بـە پێـچەوانەی ئـەم حەدیـسەوەیە، ئـەم حەدیـسە بـە پێـچەوانەی ئایەتەوەیەو........تاد!

وەك بڵێـی لاوێ: كـە (مبتـدا)و (خـبر) لەيـەك جيانەكاتـەوە، باشـتر لـە تەفـسیری قورئـانو شـەرحی سـوننەت بزانـێ هـەتا ئیمـامی ئـەبو حەنیفـەو شافیعیو نـەوەویو زوفـەرو غـەزالی (رەزای خودایـان لێ بـێ) ئێمـە نـاڵێین: ئـەم زاتانـە پێغەمبـەری مەعـسومنو هەرچـی دەفـەرموون رەتبوونـەوەی نیـە، لـە ئیسلامدا بەس حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بـێ) مەعـسومە، كەسـی تـر لـە هەڵە مەعسوم نیە، بەڵام مرۆڤ دەبێ ئینسافی هەبێ رەخنەی ئـەم كۆلكانـە لـەو بەحری عیلمانە دەق وەك رەخنەی شێت وایە لە قسەی پزیشكی ژیری كارامـەی پسپۆڕ، لە بابەت پسپۆڕیی خۆیەوە.

**شەشەم**: بەڕێزان! ئازیزان! ئەی لاوە خوێن گەرمەکان! ئێوەن جێگەی ئومێدی گەورەی ئەو میللەتەن، ئێوە چینی نوێی گەلی ئیسلامن، چینی ئایندەی ئاوەدانکەرەوەی ناو مزگەوتو سەر مینبەرو ناو میحرابن، ئاگامان لە خوێنی گەشتان هەیە: کە لە سەرانسەری جیهاندا بە دەستی نۆکەرەکانی ماسۆنییەتی جیهانی، بە خۆڕزم دەڕژێ. ئازیزان! بزانن چینی دێرین خواهـ ناخوا جێگەتان بۆ چۆڵ دەکەن، ئەمانەتان تەسلیم دەکەن، لە ژێر خاکا هەوار هەڵدەدەن، لەوێوە چاو دەبڕنە ئێوە کە ئایا وەك پێویست بە ئەرکی سەرشانی خۆتان هەڵدەستنو پەیامەکە دەگەیەنن بە ئەنجام، یان نا؟ خۆشەویستەکان! جگەرگۆشە ئازیزەکانمان! ئامان سەد ئامان، دەستمان دامێنتان! بە هەڵە لە کارەکە حاڵی مەبن، لە شت بە پەلە مەبن، ڕێز لە بابەتە زانستیەکان بگرن، باز بەسەر شتدا مەدەن، ڕێزو قەدر لە پیران بگرنو لە مامۆستا قەدیمەکان بەهرەی زانستی وەربگرنو چاوپۆشی لە حیددەتو توندیو زوو شتیان بکەن، بە ڕاستی وەك گوتراوە: "البركة مع الشيوخ!"

ئازیزان! خودا بە فەزڵی خۆی ئێوە بۆ نەتەوەی ئیسلام بکا بە چەتری ئەمان، بە شووورای پۆڵای قایم، تکاتان لێ دەکەین دوا ئەم نووسەرە بێ تەقوایانەی ئەمڕۆ مەکەون، بەخوا حەیفە پیاو لەدوا ئیبنو صەلاحو ذەهەبیو عەسقەلانیو شێخ موحەممەد عەبدەو شێخ محمد رشید رضاو مصطفى صادق الرافعيو سید قوطبو ئیبنو حەزمو ئیبنو ئەثیرو نەوەویو سیوطی، دوا کەسانێ بکەوێ کە بەبێ عیلم بەس بۆ لاسکاییو بۆ خۆ نواندنو بۆ بازرگانی، شەنو کەوێکی نەفامانەی ناحەزانەی سوننەتی حەزرەت دەکەن، گوایە پاکسازی دەکەن! خۆشەویستان! دەبێ ئێوە سەری ڕێز دابنێن بۆ مامۆستایانو حاجیانو پیران، ئەوان پێشینانی باشی ئێوەن، دەی ئێومیش پاشینانی چاکی ئەوان بن،

خۆشەویستان دەبێ باش باش بزانن کە پاکسازیو بژارکردنو سەرنج دەربڕین لەسەر سوننەت کەسو جێگەو کاتو حاڵو مەقامو کۆڕو مەجلیسی خۆی هەیە، کەی رۆژنامەو گۆڤارە رەمەکییەکانو رادیۆو تەلەفزیۆن جێگەی رەخنەو ئاخاوتنی چڕو پڕە لەسەر ئەم جۆرە شتانە، بەڵێ دروستە ئەمانە بکرێن بە مینبەر بۆ پێشکەش کردنی ئیسلام بە جەماوەر، بەڵام نادروستە جەدەلو موناقەشەو رەخنەو جەرحو تەعدیل، لە کۆڕو مەجلیسی خۆیەوە بگوێزرێتەوە بۆ سەر هەوا. برا بەخوا نە (العلم للجميع) وایە، نە (الجرح والتعديل للجميع) وایە!

ئاخر گوتەم لەم بارەیەوە ئەمەیە: (ئەمڕۆ لەرۆژئاوادا بە دەسیسەو فیتی صەلیبیو صەهیونیو ماسۆنیو عیلمانیو وجودییەکان – کە ئەمانە هەموو دوشمنانی ئاشکرای سەرەکی ئیسلامن – بزوتنەوەیێ هەیە، بەرواڵەت ئایینییە، لەراستیدا عیلمانییە، بەناوی "النقد الأعلى"وە، واتە: رەخنەی هەرە بڵند. مەبەستی سەرەکی ئەم بزووتنەوە شەیتانییە، ئەوەیە کە سەرچاوە مێژووییە دینییەکان، بەناوی پاکسازییەوە تێك بدەن، ئەمڕۆ بە فێڵ دەستیان کردووە بە لێکۆڵینەوەی مێژوویيو زمانەوانی لە بابەت کیتابی موقەددەسی خۆیانەوە، بەڵام ئەمە چەشەیەو دانەو داوە بۆ ئێمە، هەتا ئێمەیش چاویان لێ بکەینو رەخنە لە ئایەتەکانی قورئان بگرین، وەك لە هەموو شتێکی تردا چاومان لێ کردوون، بەڵێ ئەم هێرشی رەخنە توندو تیژە بۆ سەر سەرچاوەکانی سوننەت سەرەتایە بۆ هەنگاوی دووهەم کە رەخنە گرتنە لە قورئان! خوا پەنامان بدا لە کفری وا!).

**حەوتەم**: مامەڵەو رەفتارکردن لەگەڵ سوننەتدا، ئێمە دەبێ لەسەر ئەم شێوە مامەڵەو رەفتار لەگەڵ کتێبی حەدیسو فەرموودەزانەکاندا بکەن:

١- دەبێ ئەوپەڕی قەددرو ڕێزیان بۆ دابنێین، هەرکاتێ سەرچاوەی سوننەت کە دەروازەی تەغزییەی دەریای شەریعەتە، سامی نەما لەبەرچاو، بوو بە بنێشتە خۆشەی بن ددانی ناپسپۆڕان، بزانن کە ئیتر دین تەواو، لەبەر ئەوە دەبێ ئێمە وەك جاری جاران ڕەفتارو مامەڵەیان لەگەڵ بکەین، سوننەتە بە دەستی بە دەستنوێژەوە دەست لە کتێبی حەدیس بدرێ، سوننەتە بایەخی زۆریان پێ بدرێ، لە جێگەی باش دابنرێن، لەشوێنی بێ ڕێزدا دانەنرێن، شتی تریان لەسەر دانەنرێ، نابێ بە مەرەکەبی پیس، یان حەرام، یان لەسەر شتی حەرام، یان پیس، حەدیس بنووسرێ، سوننەتە گرنگی بە کاغەزو بەرگو جێگەو خەتو چاپی بدرێ، بێ ئەدەبییە بە لەشی پیسەوە دەست لە کتێبی حەدیس بدرێ، مەگەر لەبەر ناچاری، ئەگەر بە هەڵە نووسرابوو پێویستە ڕاست بکرێتەوە.

خوێندنەوەی بە هەڵە حەرامە، مەعنا لێك دانەوەی بە هەڵە حەرامترە، لەبەرئەوە پێویستە کە حەدیث بەدەرس بخوێنرێو لەلای مامۆستای پسپۆڕی دڵسۆزی سوننەت فێری لەفظو مەعنا ببین، لەبەرکردنو ڕەوانکردنی فەرموودە گەورەترین خوا پەرستییە، سوننەتە فێرکردنو فێربوونی حەڵاڵە حەدیثو پەخشو نەشرکردنی، وەك پێشینان ساغ بۆ ڕەزای خوابێ، سوننەتە هەندێ بابەتی حەدیث بۆ ڕەشە خەڵك باس نەکرێ، چونکە سەریان لێ تێك دەدا، وەك: هەندێ شت کە پەیوەندی تایبەتی بە ژیانی پێغەمبەرو خێزانەکانیەوە هەیە، (دروودی خوا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە خێزانەکانی بێ) دروست نییە حەدیث لە ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێبی ڕەمەکیو ڕەشۆکییەوە ڕاگوێز بکرێ. دروست نییە شەرحی حەدیث بەرای شەخصی بکرێ، تەرجەمەی حەدیث دروستە، لە زەمانی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕووی داوە، بۆ

هیرقەڵو نەجاشی حەدیث تەرجەمە کراوە، سوننەتە هەر لەمناڵییەوە موسوڵمان، نێر بێ یان مێ، حەدیث بخوێنێو لەبەری بکا. دروستەو حەڵاڵە حەدیث وەرگرتن لە منالی فامیدەی باوەڕ پێکراوەوە، وەك گوتمان: بێ ڕێزیکردن بە حەدیثو بە پەڕاوی حەدیث نادروستە، وەك ئەوە، لەخزمەت صەحیحی بوخاریدا کەسێ بەبێ مەهانە قاچ رابکێشێ، یا گاڵتەو گەپو قسەی ناشیرین بکا، یا شەڕە جمێن بکا. ئێمە ئەم هەمکە وەختە لەخزمەت مەلا گەورەکانی مامۆستاکانی خۆماندا بووین تەنانەت نەمان دیوە کە لەخزمەت کتێبەکانی شەریعەتدا پێ رابکێشن یا بە قاقا پێبکەنن. الله ئەدەب دەبێ وابێ!!

جارێ لە هۆدەکەی خۆمدا لە (مستشفی کرکوك العسکری) مونجیدێکم لەسەر تەجریدی بوخاری دانابوو، یا شتێکی ئاوا، مامۆستا مەلا عەبدول مەجیدی قوطب (رەحمەتی خودای لێ بێ) تەشریفی هات کە حاڵەکەی بینی چاوی پەڕییە تەوقی سەری فەرمووی: (ئەوا تەمەنم گەیشت بەم تەمەنە ئەمە یەك بێ وێڵی وا لەمەلا ببینم!).

٢- وەك عەرزتان کرا، لە سایەی بەخششی خواوە لەم رۆژگارەی ئێمەدا، بایەخی چاك دەدرێ بە سوننەت، سوننەتو قورئان بوون بە چاو ساغو هاودەمی هەموو پیرێکی نوورانیو لاوێکی رۆشنبیری ئیسلامی لەبەرئەوە ئەم دەرفەتە بەهەل دەزانم بۆ درێژە پێدان بەم دیفاعە گەرمە لە سوننەت. دەبێ لەکاتی ناوهێنانی ناوی زاناو فەرمووده زانو کتێبە گەورەکانی سوننەتدا، رەحمەت بۆ زاناکان بنێردرێ، سەڵاوات لەدیاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بدرێ، تەعظیمی ناوەکانی خودای گەورە بکرێ، نزای باش بۆ راویو موحەددیثەکان بکرێ، ناوی کتێبە گەورەکان بەرێزەوە ببرێ، لەسەر ئەم شێوەیە: "ئیمامی بوخاری (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) بە شازدە ساڵ بوخاری

**١٠- سەرەڕای ناحەزە کۆنەکانی سوننەت لەم چەرخەیشدا دوژمنی تازە بـۆ سـوننەت پەیـدابوون**، ئەمانـەیش وەك مبـشیرو مستـشرقو صـهیونیو صـەلیبیو صـەفەویو عیلمـانیو کۆمەنیـستو کەسـانی تـری لـەخۆمان کـە بـە بلوێری ئەمانە هەڵدەپەڕنو بە فیکەی دەهـریو ئیباحییـەکانی سـەما دەکـەنو بەو بایە دەژین کەلە ئەوروپاوە دێ.

شەریعەتزانی گەورە، داعیەی ئیسلامی تێکۆشەر مامۆستا شێخ موسـتەفا سـباعی لـە کتێبـی (الـسنه ومکانتهـا في التـشریع الإسـلامی)دا زۆر بـە دانایانـە بەرپەرچی ئـەم جـۆرە شـوبهەو چەواشـەکارییەی ئـەم لایەنـە دەغـەز لەدڵانـە دەداتـەوە، خـوا پاداشـتی باشـی بداتـەوە، وەك موعجیزەیـێ بـۆ دینـی ئیـسلامو نیشانەیێ لەسەر چاودێری نهێنیـی خـوایی بـۆ گـەلی ئیـسلام، لەسـایەی خـوداوە زوربـەی کـات، ئـەم رەخنـەو هێرشـە تازانـە بـە زەرەرو زیـانی خاوەنیـانو بـە قـازانجی ئیـسلام دەشـکێنەوە. چـونکە نەتـەوەی ئیـسلام پێیـان وریـا دەبنـەوەو دەکەونـە خۆیـانو، هەسـت بـە شـلۆقی هەڵوێـست دەکـەنو چـەکی پێویـست بـۆ بەرگری لەخۆیان ئامادە دەکەنو، دوژمن ریسواو تڕۆ دەکەن!.

بەڕاستی سوپاس بۆ خودا ئیسلام لە بەڵگەو هۆی بـەرگری لـەخۆی زۆر دەوڵەمەندە، خاوەنی حوججەتی بەهێزو بەڵگەی رۆشنە، قـەت قـەت بـەری رۆژ بە بێژنگ ناگیرێو بەدەمی سەگ دەریا گلاو نابێ.!

**١١- بەدەغەز ناڵێین بەڵام بەداخەوە دەڵێین**: کە هەندێ کەسـی سـەر بـە ئیـسلام لـە مەبەسـتو هێمـاو ئامـاژەی هەنـدێ فـەرموودە بەباشـی تـێ ناگـەن، لەبەرئـەوە تەسـەروع لـە رەددی دەکـەنو بـە کـەمترین شـوبهە دروسـترین فەرموودە پووچ دەکەنەوە. وەك هەندێ لەمانە دەڵێن: ئـەم فەرموودەیـە دەست هەڵبەستە کە دەفەرموێ: «اللَّهُمَّ أَحْيِنِـي مِـسْكِينًا وَأَمِتْنِـي مِـسْكِينًا وَاحْـشُرْنِي مَـعَ

الْمَسَاكِينِ». گوایە بەقسەی ئەوان ئەمە بەپێچەوانەی ئایەتی ﴿وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَى – الضحى/٨﴾وەیە، یا بەپێچەوانەی حەدیثی «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ» یا «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعَبْدَ الْغَنِيَّ التَّقِيَّ الْخَفِيَّ». دیارە کە ئەمانە سەرپێیی لە مەبەستەکان حاڵی دەبن، یا لەبەر مرازی تایبەتی خۆیان دەیانەوێ سەرپێیی لە حاڵەکە حاڵی ببن، لەم شوێنەدا مەبەست لە (مسکێن) سواڵکەریو رەشو رووتی نییە. بەڵکوو مەبەست لێی بێومێیو بێ هەواییو بێ فیزییە، مەبەست لێی کاسپکاری هەژاری ماڵی خۆیەتی، کە بەئارەقی ناوچەوان پارووی نانی حەلاڵ بۆ خێزانی پەیدا دەکا، کە ئەم جۆرە کەسانە زۆربەی کات لە زوڵمو زۆرو ستەمکاریی دوورن، لەهەمان کاتدا کاسپو تێکۆشەرو هەژاری ماڵی خۆیانو بەماڵی دنیا بایی نابنو پێی نانازن، لەهەمان کاتدا ئەم نزایەی خۆشەویست جوانترین دڵدانەوەیە بۆ چینی هەژار، وە بەڵگەی ئەوەیە کە هەژاری نەنگو شوورەیی نییە، دەنا نەدەبوو بەجێگەی شانازیی پێغەمبەران!

بەڵێ ئێمەی کورد ئەگەر سەرۆکەکانمان پابەندی ئەم سەرمەشقەی حەزرەتیان بکردایە، یا هیچ نەبێ لەم رۆژە رەشەدا چاویان لە زوهدو دنیا نەویستیی غاندی بکردایە، ئێستا ئەم گەلی کوردە ئاوا وەرەی بەرنەدەداو تەفرو نەفرەتی لە خۆپەرستیو خۆ بەزلزانی نەدەکرد. داخی بە جەرگم بەها باڵاکانو قیەم قیمەتی نەماوە، گەورە پیاوەکانمان وەك مناڵو مەزم شەیدای زەرەقیو بەرقیو کەشخەو رابواردنن، بەقەد بێگانەیەکی دوورە وڵات بەزەوییان بەم گەلە رەشو رووتەدا نایەتەوە، گەل بە گەلەران دەزانن، خوا داینێاوە بۆ دۆشینو بەس (إنا لله وإنا إليه راجعون).

بەڵگەی راستیی ئەم بۆچوونە ئەوەیە: کە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیانیدا هەرگیز خۆی لە هاورێیانی جیانەکردۆتەوە، ژیانێکی گەڵ





سادەو ساكاریی هەژارانـە ژیـاوە، وەك مرۆڤێكی ئاسایی بـێ هـەوا لـەناو مـاڵو منـاڵی خۆیـدا رەفتـاری دەكـرد. خـۆی بـە پاشـاو مـیرو ئاغـاو بـەگزادە حلێـب نـەدەكرد، گەرچـی – وەك تەحـەددوث بـە نیعمـەتی خـوا – شـانازی بـە پـاكیو پیرۆزیی خانەدانیی رەسەنی خۆیەوە دەكرد، بەڵام قەت قـەت شـانازی بـە مـاڵو سامانو رەگەزو هۆزەوە نەكردووە.

لە دانیشتنو جلو بەرگو هەموو هەڵسو كەوتێكی تریدا وەك هـەژاران دەژیا. ئەوەندە ژیانی ساكاربوو تەنانەت كە كەسێكی نـەناس دەهاتـە نـاو كـۆڕی دانیشتنی پێغەمبـەرو یـارانی، نەیـدەزانی كامـەیان پێغەمبـەرە، چونكە فـەرقو فرۆقو جیاوازیی دنیایی لەناویاندا نەبوو.

هەتا حەزرەت لەماڵەوەی بەدەستی خۆی ئیشو فرمانی ناو ماڵی دەكرد، جلو پێڵاوی خۆی بەدەستی خـۆی پینـە دەكـرد، هـەتا جـار جـارە رێ دەكـەوت لەبەر بێ هەوایی ئـاژەڵی دەدۆشـی، بـەخودی خـۆی یاریـدەی كۆیلـەو كـەنیزەكی دەدا لەكارو ئیشی نـاو مـاڵدا، هـەتا هەسـت نەكـەن كـە بەچـاوی ئاغـاو نۆكـەرو خانمو كارەكەر تەماشا دەكرێن!

جارێ پیاوێ چوو بۆ خزمەتی، زۆر سامی لێ نیشتو شەرمی لە حەزرەت كرد، خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) پێـی فـەرموو: (مەپەشۆكێ! خـۆ من پادشا نیم، هەتا سامم لێ بكەیو لێم بترسی، مـن كـوڕی ئـەو ژنـە هەژارۆكـە قوڕەیشـیـەم، كـە لەبـەر بـێ فیـزیو بـێ هـەوایی خـۆی لەسـەر تـاوێری گـەرمی هـاوین، وەك هـەژارەكان، گۆشـتی دەبرژانـدو دەیكـرد بـە لەتكـە گۆشـتو دوایـی دەیخوارد!).




**١٢- نوێكردنەوەی ئیسلام:**

هەندێ نیمچە مەلا رەخنە لەبیرو باوەڕی وا دەگرن‌و بەهەڵە لە حاڵەكە حاڵی دەبن، دەڵێن: شتی وا نابێ، چونكە سەردەكێشێ بۆ گۆڕینی نارەوای خودی دین! بەڵام رای وا هەڵەیە، چونكە مەبەست لە نوێكردنەوەی ئیسلام خستنەوە گەڕیەتی. زیندوو كردنەوەی ئەو یاساو دەستوورانەیەتی كە لەكارخراون‌و كاریان پێ ناكرێ، هەتا وەك دێرین رەفتاریان پێ بكرێ، دەنا مەبەست داهێنانی ئایینێكی نوێ نییە.

بۆ نموونە: كۆشكێ بتەوێ نوێی بكەیتەوە، واتەی وانییە كە بیڕوخێنی‌و لە جێگەكەی تەلاری تازە دروست بكەیتەوە، بەڵكوو بەوە دەبێ كە دەستێكی پیادا بهێنی‌و رەونەقێكی تازەی پێ هەڵبهێنیتەوە. كەواتە: مەبەست لە نوێكردنەوەی ئیسلام ئەوەیە: كە لەهەموو سەدەیەكا خودا مامۆستاو مەلاو زانای باش باش بڕەخسێنێ، كە رەنگ‌و رووی نوێ بە بەرنامەی ئیسلام ببەخشن، تەم‌و مژی سەر روخساری نازداری وەك دایكی هورۆی میهرەبان تەپ‌و تۆز لەڕووی كۆرپەی ئازیزی خۆی بسڕێ، ئاوا تەم‌و مژو بەڵغ‌و سیسی سەر رووی بڕەوێنێتەوە!

ئیسلام بە رێبازی نوێی هاوچەرخ لە موسوڵمانان‌و لە خەڵكی تریش خۆشەویست‌و شیرین بكەن، هەتا مەردوم لە ئیسلام بەباشی حاڵی ببن. وە وەك سەردەمی پێشینانە باشەكان رەفتاری پێ بكەن، نەوەكا خوا نەخواستە بەهۆی دووورو درێژی رۆژگارەوە بەرە بەرە موسوڵمانانیش وەك گەلەكانی تر لە ئایینەكەیان دوور بكەونەوە، یا لەخزمەتی ساردببنەوە، یا شتی ناشایستەی تیادا دابهێنن، چونكە شتی وا لە ئایینەكانی تردا رووی داوە!

وەكی تریش یاسایەكی سروشتیی خودا كردە، ناوە ناوە جۆگە دەبێ جۆماڵ بكرێ، شەقامە رێ پاك بكرێتەوە، باخ هەڵ بپاچرێ‌و موتوربە بكرێ،

مەرمزە سەرپاچ بكرێ، دەغڵو دان بژار بكرێ، مێشك زاخاو بدرێ، دل هۆشیار بكرێ!.

**١٣- هەندێ سەر لێشێواوی تر دەڵێن**: ئەو حەدیثەی كە دەفەرموێ: بنیاتو روكنەكانی ئیسلام پێنجن قەبوول نییە. چونكە باسی خەباتو غەزای تیادانییە بەڕاستی شتی وا جەسارەتو بێ ئەدەبیو رووقایمییو مەلا بەزێنییە!

جا ئەگەر بەم قسەیە بێ دەبێ گەلێ لە ئایەتەكانی قورئانیش قەبووڵ نەبن. چونكە لەكاتی باسكردنی هەندێ لە مەرجەكانی رزگاری موسوڵمان باسی گشتیان ناكا، بەڵكوو ناوی بازێكیان دەهێنێو بەس. لەڕاستیدا غەزا لە ئیسلامدا بۆ بەرگرییە لە ئیسلام، بۆ ئازادی پەخشی بەرنامەی خوایە، كەواتە هەركاتێ خەتەرێ لەسەر ئیسلام نەبوو، بە ئاشتی پەخشی ئیسلام جێبەجێ دەبوو، غەزاو شەڕو شۆڕو خوێن ڕشتنو كوشتو كوشتار هەبوونی مەرج نییە، دەی ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە غەزا روكن نییە، دەنا مەرج بۆ پێویستبوونی دانەدەنرا.

**١٤- بەڵێ نابێ بەبڕوو بیانوو بە مەهانەی ناڕەوا پەلە پەل لە پووچ كردنەوەی سوننەت بكرێ**. شتی وا كێشەی گەورە گەورە دروست دەكا. دیارە كە موسوڵمانی دڵسۆزی زانای هۆشمەند كاری وا زەقو رەق و تەق ناكا. لەكاتی وادا دەبێ بەپێی توانا فەرموودەكە ساخ بكرێتەوە، واتە: تەئویل بكرێ، نەك بەهەوای نەفس ئایەخو بێ بایەخ بكرێ. واتە: تەئویل بكرێ لەلایەنی پسپۆڕانەوە، ئەگەر هەر چارسەر نەدەكرا دەبێ جارێ وەك خۆی بمێنێتەوە، بەبێ دەسكاری، وە زانینی مەبەست لێی هەواڵەی زانستی خودا بكرێ، دەق وەك پێشینان وایان دەكرد.

رەحمەت لەدەستەی تەئویل‌و لەدەستەی تەفویض کە لەدێریندا زۆر بەجوانی چارەسەری ئەم جۆرە بابەتانەیان دەکرد، بەڵام بەداخەوە گرۆیەکی گەورە لە زانایانی ئیسلام، کە ناودارن بە موعتەزیلە، کە پیاوی مەزنی فرمزانای راڤە نووسی، وەك عەللامەی زومەخشەری، خاوەنی تەفسیری کەشاف. هەوا خوای ئەوان بووە، ئەم جۆرە تانەو تەشەرە جەرگ برانە رەواج دەدەن‌و گەڵێ فەرموودەی ساخ‌و راست‌و دروست بە مەهانەی لاوازو بەراوو بۆچوونی مەزهەبی تەسك‌و تروسکی خۆیان رەددەکەنەوە.

فەلسەفەو سەرلێشواوییەکەیان گەیشتۆتە رادەیەکی وا هەرچی ئایەت‌و حەدیسێ لەگەڵ مەزهەبەکەی خۆیان رێك نەکەوێ، یا بەپووچی دادەنێن، یا تەحریفی دەکەن، دەق وەك هەندێ سەلەفی ئاخرزەمان لەم چاخەی ئێمەدا سەریان هەڵداوە. ئەرکی ناپیرۆزی سەرشانییان ئەوەیە: کە جنێو بەدایك‌و باوکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بدەن‌و تەقبیحی شێوەی بەرێزیان لەبەرچاوی موسوڵمانان رەواج بدەن‌و دینییان حەسر کردووە لە موحارەبەی قەبرو زیارەتی قەبرو بەزۆری زۆرداری زۆربەی ئوممەتی موحەممەد بەکافر دادەنێن، لەهەموو سوننەن‌و سیرەتێك کە پەیوەندی بەرەسەنی پێغەمبەرەوە هەبێ تەنها ئەمەیان وەك تووتی لەبەرە (أبي وأبوك في النار).

هەندێکیان بۆ لاسکایی زاناکان ریشێ وەك ریشی قەلەمووەن‌و مێزەرێ وەك مێزەری فاڵچی دادەنێن! بەخودا لەبیرو باوەڕی مندا سەیگۆڵێ هەبوو، زۆر بەدیین بوو، بەڵام رەفتارێکی زۆر سەیری هەبوو، هەر مەلایەك لەبەرنوێژیدا سورەتی (تبت یدا)ی بخوێندایە، نوێژەکەی دەبڕی‌و ئیتر قەت جەماعەتی لەپشتەوە نەدەکرد. دەیگوت: مەلا چۆن شەرم ناکەی لەناو خەڵکی عەوامدا خراپی مامەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باس دەکەی؟! نازانی هەر

قسەیێ شوێنی خۆی هەیە؟ جا برا بەخودا ئەم سەیگوڵە گەڵێ لەم بەناو سەلەفییانە لەحاڵەکە باشتر حاڵی بووە، موعتەزیلەکان دەڵێن: (هەر دەقێ رێکنەکەوێ لەگەڵ بڕیاری هەستو هۆشدا قەبووڵ ناکرێو بەدەست هەڵبەست دادەنرێ!).

لەڕاستیدا ئەمە قسەیەکی حەقە، بەڵام مەبەست لێی ناحەقە، ئێمەیش بڕوامان بەم بڕیارە هەیە وە روونی دەکەینەوە کە شتی وا نییە نە لە قورئانو نە لە سوننەتی صەحیحدا، بەڵام ئەوان بەزۆری زۆرداریی زۆر شت لەم بابەتە دادەنێن مەزهەبەکەی خۆیان دەکەن بە پێوەرو تەرازوو، هەرچی لەگەڵ مەزهەبەکەی ئەوان رێکنەکەوێ بەلاوازی دادەنێنو پووچی دەکەنەوە.

بەقسەی ئەوان ئەم شتانەزی دەیاننووسین لەدواوە عەقڵ نایانگرێ: شەفاعەتو تکای پێغەمبەرانو پیاوچاکان لەقیامەتدا، پردی صیراط عەقل نایگرێ، کرداری مرۆڤ عەرەضە، جەوهەر نییە، عەرزیش جرمی نییە، کەواتە ناکێشرێ، کەواتە میزان ئەصڵی نییە، خودا زاتێکی رووتی بێ سیفەتو نیشانە دەنا تەعەدوددی قودەما روودەدا، گەڵێ بڕیاری سەیر سەیری تری لەم بابەتە.

## ١٥- سوننەت دووەم سەرچاوەی شەریعەتە:

حوججییەتو سەربەڵگەیی لە ئیسلامدا چەسپاوە، زۆر شت لەڕەوشتو مامەڵەو بڕیارو بیروباوەڕش بەپێی سوننەتی ساخ بۆتەوەو لەدییندا رسکاوەو سەری گرتووە، وە بێجگە لە سوننەت بەڵگەی قورئانی صەریحی لەسەر نییە وەك مەسحی خوفف، لەملایەنەوە شەرع زانەکان بەباشی بەهرەیان لەهەموو جۆرەکانی سوننەتو چەشنەکانیو دەلالەتەکانی کە چوارن وەرگرتووە، مەبەست لەجۆرەکانی سوننەت گوتاریو کرداریو بڕیارییە. (قەولی، فیعلی، تەقریری).

**١٦- دوو مەدرەسەی فیقهی هەیە**: دەستەی رەئیی: کەپێشیان دەگوترێ: (أهل الرأي) دەستەی فەرموودە کە پێشیان دەگوترێ: (أهل الحدیث) بەڵام بەپێچەوانەی هەڵەی ناودار کەوا مەشهورە دەستەی رای زۆر کەم بەڵگە سازی بە فەرموودە دەکەن، هەردوو مەدرەسەکە بەباشی بەپێی بەرنامەی داڕێژراوی خۆیان بەهرە لەسەرچاوەی سوننەت وەردەگرن.

پێشەوا ئەبو حەنیفە (رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێ) کەوا مەشهورە لەهەرە ناودارەکانی دەستەی رایە، وەناودارە بەسەر مەزهەب، لەمبارەیەوە ئەمە رایەتی: (یەکەم: نامەی خودا دەکەم بە بەڵگەو سەرچاوە بۆ بڕیارو بۆچوونەکانم. دووەم: سوننەتی پێغەمبەر. سێیەم: فەرمایشتی یارانی پێغەمبەر، بەڵام ئەگەر کارەکە هاتە سەر قسەی نەخەعیو شەعبیو حەسەنی بەصری، ئەوە منیش وەك ئەوان تێدەکۆشمو چیم بەباش زانی ئەوە پەسەند دەکەم، مەرج نییە کوێرانە چاو لەوان بکەم!).

پێشەوا شافیعیش (رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێ) کەزۆر میانەڕەوە لەمبارەیەوە دەفەرموێ: (هەرکاتێ فەرموودەیەکی ساخ لە مەسەلەکەدا هەبوو، ئەوە مەزهەبی منە، ئەگەر رای من بەپێچەوانەیەوە بوو، ئەوە فەرموودەکە بگرنو واز لەقسەکەی من بهێنن!).

**١٧- پێویستە فەرموودە زانو شەریعەت ناس** واتە: موحەدیثو فەقیە وەك دکتۆرو دەرمانساز هاوکاری یەکتری بکەنو تەواوکەری یەکتری بنو هەردوولا لەکاری هەردوولا بەباشی حاڵی ببن، دەنا سەر لەهەردوولا دەشێوێ، دەق وەك ئەم بارودۆخە نالەبارەی ئەمڕۆی ئێمەیە، دکتۆر دەرزیت بۆ دەنووسێ، دەرمانساز کەپسوولت دەداتێ، گەلێ جار کەپسوولەکان خاڵین، یا

بەسەرچــوون، یـــا ســـاختەن! چـــونکە ئـــەمڕۆ پارەپەرســـتی لەســـەرو تەندروستییەوەیە.

بەڵام زۆر حەیفو مەخابن، حاڵ گەیشتووە بەوە کەسانێ کتێبی شەرع دادەنێن فریان بەسەر زانستی فەرموودەو زانستە شەرعییەکانی تـرەوە نییـە. بگرە ئاگایان لەزانستی (جەرحو تەعدیل) نییەو بەقەد مەلا کوێرەیـەك ئاگایـان لـە قورئـانو زانـستەکانی قورئـان نییـەو مەرجـەکانی کـارکردن بـە فـەرموودە نازانن‌و بەواتەی وشە فەقیەو شەرعزان نین. بـەڵکوو دێـڕێ لـەم کتێبـەو دێـڕێ لەکتێبێکی تر دەهێنن‌و دەیاندەنە دەم یەك‌و ناوی دەنێن کتێب! جا کار گەییوە بـەوە هەنـدێ فـەرموودەی لاواز لەناویانـدا ڕەواجـی پەیـداکردووە، ئـەمیان لەویانەوە ڕاگوێزی دەکا، بـەبێ ئـەوە کـە ئاگـای لـە ئەصڵی فەرموودەکە هـەبێ، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەو فەرموودانە لەلایەنی زانایانی پسپۆڕەوە ئایـەخ کـراون، وە لەڕێگـەی دەروێـش‌و صـۆفی‌و زانـای ناپـسپۆڕەوە پەڕیونەتـە نـاو کتێبـی شـەرعەوە، یـا لـەکتێبی وەعـزەوەو لـەدەمی سـۆفی‌و دەروێـش‌و وەعزخوێنـەوە دزکـەیان کردۆتـە نـاو کـۆڕی مەلاکانـەوە! کـە دەیانبەیتـەوە سـەر بـنج‌و بنـاوانی دەبینی ئەو فەرموودە بێ هێزانە لەلایـەن زەڕەنگـەرانی حـەدیثـەوە لـە سـەنگی مەحەك دراون‌و ئایەخ کراون!

سەیر لەوەدایە هەندێ لەو ئەسـەرە عەنتیکانـە ئەوەنـدە بـێ سـەروبەرن لەهیچ کتێبێکی حەدیثدا نین، نە ئەصڵ‌و نە سەنەدو نە ڕشـتەیان نییـە، هـەتا ئەم هەڵە گەورانە لەم دواییەدا لەناو کتێبی فیقیهیش‌دا پەیـدابوون، وەك ئـەم حەدیثە مەوزوعە (أصحابي كالنجوم بأيهم اقتديتم اهتديتم) یا وەك: (إختلاف أمتي رحمـة)، یـا وەك ئـەو حـەدیثـە مـودرەج‌و موشـەککەلەی کـە لەسـەر مەحفـەل دەیخوێنن لەڕۆژی جومعەدا کـەرێك لـە دۆندرمـەی موشـەککەل دەکا، کـە دەڵـێ:



(فإذا ارتقي). {بڕوانـه: تـاج/١، ص ٢٨٨ وه صـهحيحى موسـليم شـهرحى نـهوهوى جـ٢ ص١٢٨ كتاب الجمعه}.

## ١٨- بههره وهرگرتن له سوننهت له مهيدانى بانگهوازدا:

مژده بهخشه ئيسلامييهكان دهبێ وريـاو زرنـگو هۆشـياربن، بـههره لـه قورئـانو سـوننهت لـهم مهيدانــه بهرينــهدا وهربگــرن، بهتايبــهتى لــه رووداوو نموونه سـهر مهشـقهكانى سـوننهت: كـهپڕن لـه فهرمايـشتى بـهرزو لـه داسـتانى جوانو لهقسهى نهستهقو له بهڵگهى رۆشن، لـه پهنـدو ئامۆژگـارى شـيرين، لـه مژدهى خۆشو ههڕهشهى كاريگهرو بهجێ، له رانومـاييو رابـهريى رێـكو پێـك: كهدهبن بههۆى رۆشنبوونهوهى چاوو دڵو هۆشو گۆش، وه مێشكيان پـێ زاخـاو دهدرێتهوه، ئهگهر بهجوانى بههرهيان لێ وهربگيرێ كهسايهتى موسـوڵمان لهسـهر شێوازى پهسهندى نايابى ههمهلايهن تهواو دادهمهزرێ، وهك وێنهى جوان لـهناو ئاوێنهى باڵانوماندا رهنگ دهداتهوه!

لهڕاستيدا لهكتێبهكانى سوننهتدا سهرمايهو سامانێكى فـره زۆرو بـهنرخ ههيه، گهنجينهيهكى لهبن نههاتووه بۆ بانگـهوازكارى ئيـسلامى، دهتوانـێ بـهدڵى خۆى توێـشووى تـهواوى لێ بكـاو ههمانـهى لێ پڕبكـاو لـه بانگهوازهكهيـدا تـهواو سهركهوتوو بێ.

لهپاش قورئانى پيرۆز بانگـهواز كـار دهبـێ بـههره لهصـهحيحى سـوننهت وهربگــرێ. وهك صــهحيحهينو ســوننهنى ئهربهعــهو ريــاض الــصالحينو تــاج الأصولو دارمـيو صـهحيحى ابـن حبـانو جـامع الـصغيرو............تـاد، بـهلاّم دهبێ ههتا بۆى دهكرێ پشت بـه فـهرموودهى سـاخ ببهسـتێ، لهمهبهسـتى دوورو نزيكى حاڵى ببێ. نهك سهربكاته ريوايـهتى حـهديثى لاوازو حهقايـهت خـوانى، دهبێ ههر دهستهيێ بهپێى پايـهى هۆشـيارى خۆيـان قسهيان لهگهڵدا بكـا، دهنـا

وەك ئەوە وادەبێ نان لەباتی ئاو بدەی بەتینووا داخی بەجەرگم زۆر لەوتار خوێنەكانمان لەهەقایەت خوێن دەچن نەك لەپەندیارو ئامۆژگاری هۆشیار!

ئەوەیشمان لەبیرنەچێ داعییەی بێ تەقوا، وەك مەلای نامەلا. دەردی بێ دەرمانە. زیانی پترە لەقازانجی، ئومێد دەكەم ئەم جۆرە كەسانە بەرە بەرە لەمەیدانی بانگەشەی ئیسلامدا جێیان نەبێتەوە، ئێستا داعییەی دڵسۆز مەهانەی نەماوە، چونكە هەموو سەرچاوەكانی سوننەت پێرستو ژمارەو شەرحی روونو سەرباسی باش بۆ بابەتەكانیانو تەرتیبو تەبوبیبیان بۆكراوە، زانای دانا بەئاسانی دەتوانێ وەك گوڵێ لەباخێ بپچڕێ، هەر فەرموودەیەكی لەهەر بابەتێ دەوێ لەناو ئەم خەرمانی گەوهەرەدا بدۆزێتەوە، بگرە زۆربەیان بە كۆمپیوتەر كۆنترۆڵ كراونو زۆر زانیاری بەنرخیان لەبارەوە تۆماركراوە. هەروا زۆریان لەلایەنی پسپۆڕانەوە تەخریج كراونو پلەی بەهێزیو بێ هێزییان دیاری كراوە، لەبەرئەوە مەهانە نەماوە بۆ گێڕانەوەی ئەم جۆرە فەرموودە لاوازانە. كە گەلێكیان دەڵێی پڵی بەڵەكیین لەپەنا خاڵی جوانا.

ئەوەتا حافیزی عێراقی تەخریجی حەدیثەكانی ئیحیای غەزالی كردووە. عەسقەلانیش تەخریجی حەدیثەكانی كەشّافی كردووە نەبادا مەردووم بە ئیعتیماد لەسەر نەقڵی عەللامەی زومەخشەری بۆ ئەو حەدیثە لەو تەفسیرە مەزنە پیرۆزەدا دەستخەڕۆ ببن. راڤەو شیكردنەوەی باشیش لە حەدیث كراوە وەك: فتح الباری لەسەر صەحیحی بوخاری، وەك شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم (رەحمەتی خوا لەسەر هەموویان بێ). جا واباشە كە لەمەولا مەلا مەلابێ، لەمەولا بەبێ هودە ئەو فەرموودە لاوازانە نەجووینەوە، كەڕوپەڕی زۆر لەكتێبە دێرینەكانی زانا گەورەكانیشیان لەكەدار كردووە، وە هاوكاری نەكەین لەسەر پەخشەوە بوونیان لەكۆندا باوبوو هەر لەگەڵ خاوەن

تەفسیرێ، یان خاوەنی کتێبێ، قسەیێ، حەدیسێ، یا سەرگوزشتەیەکی لەناو کتێبێکی خۆیدا دادەنا ئیتر دوا ئەو دەبوو بەچاو لێکەری بەبێ سێو دوو لێکردن، ئەو حەدیثە لەمەوە بۆ ئەو دەست بەدەستی پێدەکراو دەبوو بەبنێشتە خۆشەی بن ددانی هەقایەت خوانەکان!

خۆ ئەگەر پیاوێکی ژیر نارەزایی لەشتێ دەربڕییایە دەهاتنەوە بەدەمیداو دەیانگوت: (تۆ فەقێی تەواویش نیت کەچی رەخنە لە سەعدی تەفتازانی دەگری)!

بەڕاستی ئەم وەڵامە بێ تامە بۆماوەیەکی زۆر بووبوو بە قفڵێو درابوو لەدەرگای وریابوونەوەو هۆشیار کردنەوە.

لەڕاستیدا حەدیثی صەحیح، دەق وەك ئایەتەکانی قورئان فامی تەواویان لەتوانای نیمچە خوێنەوارو کۆلکە مەلادا نییە، بەڵام حەدیثە کێویلە ئەوەندە سادەو ساکارو ئاسانە دەڵێی قسەی بەر ئاگردانی پیرێژنانە، لەبەرئەوە بووە بەخۆشە چەرەی دەمی نیمچە خوێنەوارەکان.

بەداخەوە لەمجۆرە رێگایانەوە کتێبە مەزنەکانی تەفسیرو وەعزو ئامۆژگاری پڕبوون لە هەقایەتو خەونو شیعری جنۆکەو ئیسرائیلیاتی پڕوپووچو فەرموودەی بێ سەروبەر، وەبوون بەسەرچاوەو بۆ گەیێ بۆ ژینگەی ماکی بڵاوبوونەوەی ئەفسانەو پڕوپووچ، بەناو سەرانسەری وڵاتی ئیسلامدا، لەهەرکوێ دەچی دەقائیقول ئەخبارو عصفوورییە لێت دەبن بەمووی بەرلووت، لەیادم دێ لەم شاری سلێمانییەی خۆماندا لە رەمەزانانا کە وەعظ دەخوێندرایەوە بەس مامۆستا مەلا ئەسعەدی مەحویو مامۆستا مەلا عەبدولڕەحیمی پەرخی (رەحمەتی خودای لێ بێ) حەدیثی بوخارییان عەصران بۆ نوێژکەران دەخوێندەوە، لەبەرئەوە جەماوەریان کەمبوو. خەڵکە ساویلکەکە

دەیانگوت: ئەمە کەی حەدیثە ئەمانە دەیخوێننەوە، خۆشیان نازانن دەڵێن چی. وەڵا دوێنێ مامۆستا مەلا مەحموو باسی مارێکی حەوسەری بۆ کردین ئەمشەو هاتبووە خەوم وەخت بوو زیرە بکەم هەتا بەیانی خەوم لێ زڕا!

ئیتر مەلاکانی تر، لەباشترین حاڵدا، (أرشاد العباد) چەکی مەچەکیان بوو. ئەوەندەیان دووبارەو دەبارە کردبووەوە دێوانەو دەروێشەکان لەخۆیان باشتریان لەبەربوو!

بەڵام ئەمڕۆ دەبێ بانگخوازو داعیەو موژدە بەخشەکان، لەم بابەتانەدا ئەسپی خۆیان غاربدەنو دەماغ بسوتێننو ئەم جۆرە بابەتە گرنگانە پەخشو بڵاو بکەنەوەو بانگەشەیەکی پیرۆزیان بۆ بکەن. بەڵام زۆر بەزانستانەو لێزانانە، لەڕاستیدا ئەمڕۆ لەسەرانسەری جیهاندا بۆشاییەکی ئایینی هەیە، هەموو نەتەوەکان باوەڕیان بە ئایینی خۆیان لەق بووە، گوشاری لایەنە ئایینییەکان وەك کۆن ڕۆڵ نابینێ، بەگشتی مەردوم بەشوێن ئایینێکی پاکی پیرۆزی ڕێکی هۆشی ساغی گونجاو لەگەڵ ویژدانو ڕەوڕەوی ژینی نوێدا دەگەڕێن، کە بەرنامەیەکی ئاسانی ڕۆشنی کورتو پوختی هەبێ، هەم گیان پەروەردە بکا، هەم لەشو جەستە بەخێوبکا، ئەمەیش تەنیا لەئایینی پیرۆزی ئیسلاما هەیە، بەمەرجێ بزانین: کە پێشکەشی ئەو جەماوەرە تامەزرۆیەی بکەین: کەزۆر بێزارن لەئایینی پڕ لە پڕوپووچی خۆیان، کەواتە داعیەی ئیسلامی دەبێ سوارچاکی ئەم مەیدانە بێ: (ئیمانو باوەڕو تەوحیدو یەکتاپەرستی، عیبادەتی ساغ، دوور دوور لەدارو بەرد پەرستی، عیلمو ئەدەب، زانستو وێژە، شیعرو پەخشانی جوان، زوهدو ڕەقائیق، تەرغیبو تەرهیب، زیکرو دوعاو نزاو یادی خواو، قورئانو زانستەکانی قورئان، چاکەخوازی، بێوەیی، خێرکردن، خزم دۆستی، هەواڵەکانی قیامەت لە بەرگێکی نوێدا، باسی

بەهەشــتو قیامــەتو دۆزەخو بــەرزەخو فەرتەنــەکانو نیــشانەکانی هــاتنی قیامەتو باسی نامەی کردارو تۆماری کردارو پـردی صـیراطو میـزانو حەشـرو نەشرو قـەبرو گـۆڕو مـەرگو تاڵاوەکـانی سـەرەمەرگو باسـی ژیاننامـەی گـەورە پیاوانی ئیسلامو باسی خەباتو غەزەوات، هەروا داستانە جوانەکانو چیرۆکە پڕ لـەپیتو فـەڕەکانی قورئـانو باسـی مێـژوو خۆشەویـستی نیـشتیمانو، پـیرۆزی خـاکی ئیـسلامو شـەهیدبوونو خـەباتو تێکۆشـانو باسـی یەکـسانی بـەرەی ئادەمیزادو مرۆڤ دۆستیو مافی مرۆڤو هەتا مافی گیانلەبەرانی تر).

لەهەمان کاتدا دەبێ ئیسلامی خوا هەلو دەرفەت بەهەل بزانێ هەمیشە رووی جـوانی ئیـسلام دەربخـاو خـۆی بـەکردارو بـەگوتارو بـەرەفتار نوێنـەری راسـتەقینەی موسـوڵمانان بـێ، لەسـەرو هـەموو شـتێکەوە نیـازو مەبەسـتی سـاخ رەزای خودابێ هەتا خوا پیتو فەڕ بخاتە کۆششەکەی!.

داعیـەی بـێ تـەقوا وەك خـوێی تـاڵ وایـە، چێـشتەکەیش تـاڵ دەکـا، خـوا پەنامان بدا لـە تـەفرەی شـەیتانو لـە بـەخۆوە نـازینو لـەبایی بـوون. بەڕاسـتی شەیتانی بارنەفرین هەمیشە وا لە بۆسەو کەمیندا بۆمان، ئەگەر کەسـێ بەقـەد ئەو مەجێزو سووربێ لەسەر کاری خۆی یەکەم دەبـێ، بەهـەرحاڵ بـە نـەفرەتو لەعنەت بێ.

**١٩- لەم رۆژگارەی ئێمەدا خەڵك کەمتر لە بابەتەکانی تەصەووف تـێ دەگەن**. لـەجێی ئـەوە پێویـستە جـەماوەر فێـری صـەفای رۆحـی، سـینەی سـاف، بەهرەی گیانی، بگرێ. هەر هیچ نەبێ مەیلی ئەهلی صەفایان هەبێ، با دەروێش نەبن، بەڵام وەك دەروێش بێوەی بن، با سۆفی نەبن، بەڵام مەشـرەب سـۆفی بـن، هەتا دووربکەونەوە لە ماددە پەرستی، کـە بەڕاسـتی رەوورەوەی ژینـی تێـك داوە. وابڕوا ناگاتە سەد ساڵی تر کەس أعتراف بەکەسی تر ناکا. گەرچی بـاوی وشکە

سۆفێتی نەماوە. بەڵام زۆر لەزاناو مەلاو واعیظەکانی ئەم زەمانەیش بەڕاستی بێ تەقوان. هەندێکیان بوون بە بڵندگۆی لایەنە رامیاریەکان، لەبەرئەوە قسەکانیان زۆر بێ تامە. روخساریان گرژو کرژو کاڵو تاڵە، وەك پێشینانە باشەکان خاوەنی چارەی شیرینو روخساری نوورین نین. لەڕاستیدا خەطیبو وتارخوێنو واعیزەکانمان، دەبێ هەتا هەتایە واز لەوشتە سادە بێ کاکڵانە بهێنن، کەدەبن بەهۆی ورووژاندنی هەستو سۆزی جەماوەر بۆ ماوەیەکی کەم. وەهیچ کاریگەریەکی جەوهەری لەناخیاندا دروست ناکەن. چونکە شتی وا عەوام فریودەرو رەشە خەڵك خەڵەتێن، هیچی لێ سەوزنابێ، رێك لەچاووراوی سیاسەتزانە فرە درۆزنەکان دەچێ.

کاکە! ئەمڕۆ جەماوەر رۆشنبیربووە، وەك جاران نەماوە، شتی بێ بەڵگە ناسەلمێنێ، شتێ عەقڵ نەیگرێ وەری ناگرێ، لەهەموو شتێ دەکۆڵنەوە، باوەڕ بە گارەشو ماسی بن زەوی ناکەن، ئەم جۆرە درۆیانە لەکۆنیشدا کەم کەس بڕوای پێ دەکردن جا دەبێ لەم رۆژگاری زانستییەدا کێ باوەڕیان پێ بکا. سەلامو خەیام خوا رەحەم بەحاڵیان بکا.

بە بەلاش پیرەمێردی شاعیر نەیگوتووە:

کایە لە ئاسمان ناوی پەروینە
کایە کۆڵەکەی ژێری زەمینە
بەچاوی ژیری کە وەك دووربینە
لەبەینی دوو کا کەر گەل ببینە!

**٢٠- لەڕاستیدا مەلاو زاناو وتار خوێن هەتا زاناترو شارەزاتربن لەبواری سوننەتی ساخدا سەرکەوتووتر دەبن،** لەخزمەتی ئیسلامدا. لەبەرئەوە دەبێ هەتا صەحیحی بوخاریو موسلیمو ریاض الصالحین وەستابێ کاریان بە دەقائیقول ئەخبارو عوصفوریەو شتی وا نەبێ، بەڵکوو ئەم جۆرە پەڕتووکە پەرپووتانە باویان بەسەرچوو. ئەصڵەن دروست نییە کە چاپ بکرێنەوە. چونکە گەلێ لەو حەدیثە کێویلانەبوون بەدڕكو داڵو گژوگیای ناو گوڵزاری سوننەت، کاتی ئەوە هاتووە کە بژاربکرێنو کتێبی وەعظو رابەرییان لێ پاکسازی بکرێ. راستە لەکۆندا مارێ بەدەستی دێوانەیەکەوە بەقەد سەد کتێب لەناو جەماوەرە نەخوێندەوارەکەدا، کاری لەخەڵکی ساویلکەی بێ سەواد دەکرد، بەلام ئەمڕۆ رۆژ رۆژی رۆشنبیرییە، جەماوەر گۆڕاوە، خەڵك دکتۆرە، ئەندازیارە، خوێندەوارە، مامۆستایە، زانایە، دانایە، رۆشنبیرە، شاعیرە، نووسەرە، بگرە هەتا خۆڵرێژەکان، بەهۆی دەسگاکانی راگەیاندنەوە، بەقەد نیمچە میرزایەك ئاگادارییان هەیە. وەکی تریش لەسایەی خوداوە، ئیسلام ئایینی زانستە، دینی هۆشی ساغە، ئایینی مرۆی رۆشنبیرە، دینی حەقە، دژی ناحەقە، بۆ خۆی دەفەرموێ: (وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ) لەبەرئەوە پێویستی بە پڕوپاگەندەی بێ سەروبەرو پشت گیریی ئەفسانەگەریی نییە.

ئیسلام خۆی هەمیشە پشتی هۆشی ساغو زانستی راستو بیروباوەڕی بەرز دەگرێ، دژی ئەفسانەو پڕوپووچو شتی وایە، ئەوەتا ئەم مەبەستە بەرزانەی لەخۆ گرتووە.

أ- تەوحیدو نبوەت.

ب- بەعثو مەعاد.

ج- باوەڕ بەڕۆژی دوایی. بەحیسابو بەکیتاب.

د- ژیان هەوانتەو بێ هودەو عەبەث نییە.

هـ- تاوانو چاکە چون یەك نین.

و- فەرمان دەکا بەچاکە، نەیی دەکا لەخراپە.

ز- هۆشو عەقڵ سەرچاوەی بیروباوەڕو عەقیدەی راستو دروستن.

**٢١- تێگەیشتن لە سوننەت لەبەر رۆشنایی دەقەکانی قورئانی پیرۆز:**

ئەگەر بمانەوێ بەرێكو پێکی لە کرۆكو جەوهەری سوننەت حاڵی ببین، وە تووشی دەستکاریو گۆڕانکاریو ساخکردنەوەی هەڵە نەبین، دەبێ لە لێحاڵیبوونەکەماندا لەبازنەی دەقە رۆشنەکانی قورئان دەرنەچین. چونکە جەوهەری ئیسلام ئەوەیە کەوا لە قورئانا، قورئان دەستووری نەمری ئیسلامە. دەشێ گشت یاساکانی تر سەرچاوە لەو هەڵ بگرن. نابێ لەهێڵی ئەو دەربچن، راستە کە سوننەت روونکەرەوەی پوختە قورئانییەکەیە، بەلام نابێ لەدژی ئەوبێ، دەبێ سوننەت لە سوورگەی قورئان لانەدا، دەنا لەبازنەی سوننەتی ساخ دەردەچێ، بەسە بۆ لاوازیی حەدیث کە لەگەڵ دەقی رۆشنی ئایەتدا کۆڵەکەبدا، لەم روانگەوە روون دەبێتەوە کە چیرۆکە لاوازەکەی (الغرانیق) دەست هەڵبەستەو بێ سەروبەرە، چونکە بەپێچەوانەی مەنطیقی قورئانە. هەروا ئەم فەرموودەیەیش کە دەڵێ: (شاوروهن و خالفوهن): راوێژ بەژنان بکەن . بەلام هەرچییان گوت بەگوێیان مەکەن) چونکە ئەمە پێچەوانەی دەقی ئەم ئایەتەیە کە راوێژکردن بەژنانو بەگوێ کردنیان بەکارێکی بەجێ دادەنێو دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَنْ تَرَاضٍ مِنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا – البقرة/٢٣٣﴾.

بەلام ئەم فەرموودەیەی تر: کە کێشەیەکی گەورەی دروست کردووە، کە موسلیم (رەزای خودای لێ بێ) دەیگێڕێتەوە، کە دەفەرموێ: «إِنَّ أَبِي وَأَبَاكَ فِي

النَّارِ». که لەپێشەوە لەزنجیرە (١٤)دەدا رابورد. که لەگەڵ ئایەتی: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا – الإسراء/١٥﴾دا رێك ناكەوێ. ئەم فەرموودەیە لەبەرئەوەی صەحیحە چاك وایە ئیستی تیابكرێ، نەك بەبێ پەروا نایەخ بكرێ، چونكە هەڵ دەگرێ مەبەست لێی شتێ بێ ئێمە لەم كاتەدا دەركی نەكەین.

بە بۆچوونی من مەبەست ئەوەنییە كە باوكی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە دۆزەخدا هەتایە دەمێنێ، ئەمە لەبابەتی ئەم ئایەتەیە: ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا – مريم/٧١﴾ كەسیش نەیگوتووە مەبەست لە (ورود) لەم ئایەتەدا (خلود)ە. هەزار رەحمەت لە سوهەیلی كە دەفەرموێ: (ئێمە مافی ئەوەمان نییە كە باسی شتی وا بكەین چونكە حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەهۆی جنێودان بەمردوو، ئازاری زیندوو مەدەن، خوای گەورەیش دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ – الأحزاب/٥٧﴾ كەواتە: ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنە زانستی زۆری دەوێ، هەربەوە نابێ كوێرانە چاوێ بەدەقی حەدیثەكەدا بخشێنیو تەواو).

## ٢٢- لاف لێدانی پێچەوانەی قورئان هەروا بەئاسانی سەرناگرێ، دەبێ مەسەلەكە بەوردی شی بكرێتەوە:

لەبەرئەوە هەتا بۆمان دەست بدا دەبێ ئەم مەیدانە تەنگ بكەینەوە. نەبادا ئێمەیش بكەوینە هەڵەی موعتەزیلەكانەوەو سوننەتی صەحیح بە ئیددعای پووچ ئایەخ بكەین.

بۆ نموونە: كۆمەڵێ بەڵگەی رۆشن هەن لەسەرئەوە كە مرۆڤ بەهرەو سوود لەكرداری كەسێكی تر وەردەگرێ، كەچی موعتەزیلە ئەوە رەدد دەكەنەوە، بەهەندێ بیانوو. لەبابەتی تكاكارییەوە لە قیامەتا، فەرموودەو ئایەتی زۆر

هەیە لەسەر هەبوونیو گیرابوونی، کەچی ئەوان دیسان باوەڕیان بەهەبوونی شەفاعەت نییە. ئایەت دەفەرموێ: ﴿مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ – البقرة/٢٥٥﴾. ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى – الأنبياء/٢٨﴾ حەدیث دەفەرموێ: (شەهید بۆ حەفتا کەس لە کەسوکاری تکا لەخودای گەورە دەکا لەرۆژی قیامەتا).

ئەوەی لەشەریعەتدا چەسپاوە ئەمەیە: مەرج نییە هەموو تاوانێ تۆڵە لە خاوەنی بسێنرێ. گوناه هەیە تەوبە پاکی دەکاتەوە خێرو نوێژو چاکە گەلێ جار دەبن بە کەفارەتی گوناه، بە مایەی بەرزەوەبوونی پایەو پلەی، مەرج نییە پاداش بەپێی کردەوەبێ، چونکە خودا خۆی کارا (فاعیل)ی سەرپشکە، حەزکا لەتاوان خۆش دەبێ، حەزکا چەند قات پاداشتی دەداتەوە، لەهەمان کاتدا نزاو پاڕانەوەی کەسێ بۆ کەسێکی تر سوودی هەیە، نوێژکردن لەسەر تەرم سوودی هەیە بۆی، وەقف بۆ مردوو قازانجی هەیە بۆی، دانەوەی قەرزی سەر مردوو لە ئۆباڵی ئەو قەرزە رزگاری دەکا. کەچی ئەوان واتای ئەم ئایەتە ﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى – النجم/٣٩﴾ والێك دەدەنەوە کە ئەم کۆمەڵە بەڵگە روونو ئاشکرایەی پێ پووچ بکەنەوە، گوایە بەقسەی ئەوان بێ: هەڕەشە لەبەڵێنی دەباتەوە، عەدلو دادپەروەری لەپێش میهرەبانیو رەحمەتەوەیە، بڕیاری هۆشی ساغ لەسەر بڕیاری بەڵگەی شەرعی پێش دەخرێ، لەڕاستیدا لە قورئاندا: تکای بتو خودا درۆینەکان قەدەغە کراوەو بەس، ئیتر هەرچی لەم بارەیەوە بگوترێ راست نییە کەواتە ئایەخکردنی ئەو هەمکە فەرموودە ساغانە بەم جۆرە بیانگانە تاوانە، نەك پەیڕەوی فەرمانی قورئانە.





**٢٣- یەكێ تر لە هۆیەكانی چارەسەركردنی كێشەی ناو دەقە ناتەبایەكانی سوننەت بەدیمەن جەمعو كاراكردنە بەهەموو دەقەكان، هەریەكەی لەمەودایەكا:**

یاسایەكی دامەزراوە: (سوننەت روونكەرەوەی قورئانە) وەك لەفزە قورئانییەكە رەهایەو موتڵەقە، سوننەت پابەندی دەكا بە شتێكەوە، یا بێژە قورئانییەكە بۆ گشت سوننەت مەبەست لێی روون دەكاتەوە، ئیتر هەروا، دەی دیارە هەمان یاسا بۆ روون كردنەوەی سوننەتیش هەروایەو سوننەت بە سوننەت روون دەكرێتەوەو برێ فەرموودە دەبن بە شەرحو راڤەو روونكەرەوە بۆ برێ فەرموودەی تر!

جا بەم یاسایە چارەسەری گەلێ لە گیروگرفتی نێوان دەقە جیاجیاكان دەكرێ. بۆ نموونە: چەند فەرموودەو گێرانەوەیەك هەن لەبارەی كورتكردنەوەی جلو بەرگەوەو لەبابەت شۆڕكردنەوەی داوێنو دەرەلنگو پۆشاكەوە بەگشتی!

هەندێ لاوی بێ ئەزموونی خوێن گەرم ساكارانە بە ساویلكەیی لە كارەكە حاڵی دەبن، وا دەزانن كە كورتیی جل لەزاتی خۆیدا پەرستشو عیبادەتە، شۆڕكردنەوەی چاكو داوێنو فەقیانە لەزاتی خۆیدا تاوانە، حیكمەت لەم دووكارە رەچاو ناكەن، لەبەرئەوە هەركەسێ جلو بەرگی بەپێی ئەو فەرموودە ساخانە نەبێ بەبێ دینی دادەنێن.

بەڵام كاتێ دەچیتەوە بنجو بنەوانی بابەتەكەو هەموو فەرموودەو گێڕانەوەو رووەكانی بابەتەكە لەگشت رێگەكانیەوە كۆدەكەیتەوەو بەرابەریان دەكەیو دەیان كەی بەراڤە كارو روونكەرەوەی یەكتری، دەردەكەوێ كەجل كورت كردنەوە هەتا قولەپێ، یا شۆڕكردنەوەی لەوەزیاتر، لەزاتی خۆیدا ئەو بایەخەی نییە، بەڵكوو مەبەست رێگەنەدانە بەفیزو دەعیەو كەشخە، بایەخدانە بەبێ

هەوایی، کەواتە: ئەگەر کەسێ بۆ فیزو دەعیەو ریابازی جلی خۆی کورت بکاتەوە، هەمان رەخنەی لێ دەگیرێ. ئەگەر کەسێ بۆ مەبەستێکی رەوا جلی خۆی شۆڕبکاتەوە، لەبەر سەرما، یا لەبەر گەرما، یا لەبەر دەرنەکەوتنی جەستەی وەکوو ئافرەت، یا بۆ جوانیو خۆ رازانەوە، بەبێ فیزو دەعیە، ئەوە گلەیی لێ ناکرێو بەر هەڕەشەی ئەم فەرموودانە ناکەوێ کە بەلگەی نەیی کردنن لە شۆڕکردنەوە، یا دەبن بە بەلگەو هۆ بۆ جل کورتکردنەوە {بڕوانە: ریاض الصالحين ب/٢، لاپەڕە: ٦٧٢، زنجیرە: ١١٩}.

لەڕاستیدا رەفتاری جوانو کرداری شیرین جەوهەری کارنو سوورگەی بڕیارەکانی شەرعن، نەك دیمەنو دیمەنکاریو خۆ خەریك کردن بە روالەتو توێکڵو شەکڵ پەرستییەوە، چونکە زۆر شت بەپێی رۆژ دەگۆڕێ، مەسەلەی جلو بەرگ لەو بابەتەیە. بۆ جەوهەری بابەتەکە سنوورێکی کورتو پوختی بۆ دیاری کراوە، مەرجی جلو بەرگ ئەوەیە شەرمو شکۆی تیادابێ، داپۆشەری شەرمگا بێ، ئیتر پتر لەوە عورفو باو دیاری دەکا، کە گەلێ جار بەپێی سەرماو گەرمای شوێن دەگۆڕێ، جلی کار جیایە لەبەرگی نووستن، هی شاییو شادی جیایەلەهی شینو شەپۆڕ. نە ئەقڵ نە نەقڵ شتی وا ناگرێ کە بووکێ لە سالۆنی خۆڕازاندنەوەوە بە بەرگی بوکێنییەوە بچێ بۆ پرسەی دەستە خوشکێکی خۆی!

سەرەڕای ئەم بەلگانەیش خوا بەگشتی رێگەی جلو بەرگی جوانی رێكوپێکی داوە، بەڵکوو فەرمانی کردووە بەخۆ رازاندنەوە لەکاتی نوێژەکاندا. دەفەرموێ: ﴿خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ - الأعراف/٣١﴾. ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ - الأعراف/٣٢﴾.

حافیظی عێراقی دەفەرموێ: (باو واتە: عورفو عادەت حوکمو بڕیاری خۆی هەیە، زاراو کاریگەری خۆی هەیە).

وەکی تریش گوێ نەدان بەباوو نەریتی ناو کۆمەڵ سەرنج رادەکێشێو کێشە بۆ خاوەنی دروست دەکا، وەك گوتراوە: پۆشاکێ بۆ ناوو شۆرەت بێ، خاوەنەکەی پێ سووك دەبێو لە شەرعیشدا ناپەسەندە، دەی کەوایە مامناوەندی لەهەمووی باشترە.

ئەوەیشمان لەبیرنەچێ ئەگەر کەسێ بۆ دەربازبوون لە راجیایی‌و ساغ بۆ پەیڕەویی سوننەتو بۆ کردنی حەزرەت بەسەر مەشق لەبەرنامەی ژیانیدا، دەقاو دەق کردارو رەفتارو گوفتارو گوتاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جێبەجێ بکا، ئەوە کەس رەخنەی لێ ناگرێ، بگرە کارێکی زۆر باش دەکا، خۆزگەمان بەخۆی، بەڵام نابێ شەقامە رێگەی گوشادی شەریعەت لەخەڵك تەنگەبەر بکاتەوە، بەهۆی تێگەیشتنی هەڵەوە، لەهەمان کاتدا بڕیاری شەرع، بەقسەی خلەو بلە ناگۆڕێ، مەردوم لە پەیڕەوی شەریعەتدا دەبێ چاویان لەدەمی مەلاکان بێ، مەلاکانیش دەبێ پشت بە کتێبە گەورەکانی شەریعەت ببەستن لە فەتواکانیاندا، دەنا دەگەرو بایەخ بۆ قسەی رەشۆکی کەس نییە!

نموونەیێ تر: بڕێ فەرموودەی تر زەمی یەرەقو هەوجارو گاسنو دەست گرتن بەکلکی کاوە دەکەن، کەچی فەرموودەی ساخی تری زۆر هەیە وەسپی جوانو پەسنی مەزراو باخو دار ناشتنو کشتوکاڵ دەکەنو مژدە دەدەن بەکەسێ دارێکی بەری بنێژێ. کەواتە: راستە کە دەڵێن: (هەر قسەیێ کاتو جێگەی خۆی هەیە).

**كورتـو پوخـت**: رەحمەت لەپێشینان کە دەفەرموون: (نان بۆ نانەوا گۆشت بۆ قەصاب) واتە: لەبابەتی ئاییندا قسەی مەلا دەخوا، نەك قسەی خەڵکی رەشۆکی با رۆشنبیرێکی گەورەیش بێ.

**٢٤- ئەمڕۆ کوفری جیهانی بەڕابەریی رۆژهەڵاتناسەکان،** هێرشێکی قورسی راگەیاندنیان سازکردووە بۆ بەرهەڵستیی نووری قورئانو، بۆ شێواندنی چارەی جوانی ئیسلام. بەم دوو نیازە پیسە: چاویان بڕیوەتە ئەو هەمکە خێرو بێرەی لە خاکی ئیسلامدا هەیە لەوەیش دەترسن لە ئاییندەدا ئیسلام ببێ بە قەڵایەکی قایم بۆ نەتەوە ستەمدیدەکان، جا بۆ کاریگەریی هێرشە گڵاوەکەیان مەسحێکی تەواوی ئایەتەکانی قورئانو بابەتەکانی سوننەتو رووداوەکانی سیرەتیان کردووە. وە لەکوێ شتێ بۆنی بۆرە تانەیەکی لێ بێ، لە ئیسلامو لە گەلی ئیسلامو لە زانایانی ئیسلامو لەزاتی پێغەمبەر خۆیو، لە کەسوکاریو، لە یارانیو لەسەرجەمی ئوممەتی موحەممەد. دەیقۆزنەوەو یەك بەهەزار گەورەی دەکەنو پڕوپاگەندەی بۆ دەکەنو پەخشو بڵاوی دەکەنەوە، خۆ ئەگەر بتوانن لە رێگەی موسوڵمانەکان خۆیانەوە ئەو ژەهرە بڕێژن ئەوە لەسەدا سەد سەرکەوتن مسۆگەر دەکەن!

قەت قەت وەك ئەمڕۆ فەلسەفەو حیکمەتو ئەدەبو زانستە گیانیو بەهرەییەکان ئاوا ساکارو ساویلکانە نەبوون، غەزوی سەقافی کارێکی کردووە دوژمن پێویستی بەشیرو تیر نەماوە، بۆ گرتنی سەرو ماڵو خاکی نەتەوەکان. بۆ غاراتکردنی سەرو ماڵو سامانو ناموسیان، بەسە بۆئەوەی ئاژاوەیەکی گرنگ، یا هەڵگەڕانەوەیەکی گەورە لەناو گەلێکدا، بۆ تەفرەدانی، بە درۆیەکی گەورە، یا بە فلیمێ، یا بەهۆی گۆرانییەکەوە، یا بەهۆی دەنگی ژنێکی گۆرانی

بێـژەوە، دروسـت بکـەن‌و، وایـش بکـەن کـە جەماوەرەکـەی بـەبێ سـێ‌و دوو کۆلێکردنەوە بڕوای پێ بکەن.

بەداخـەوە لاوەکـانی خۆمـان بـە بـەریقی ئـەم هێرشـە ناهەقـە شـەوارە کەوتوون. زۆربەیان وەك هەویر لەدەستی نانـەوادا خـۆی تەسـلیمی راگەیانـدنی رۆژهـەلأت کـردووە. بـە واتـای وتـە بـووە بـە دەرویـشی ئەکتـەرو سـەماکەرو نووسەرەکانی ئەوان فڕی بەسەر وڵاتو نەتەوەو ئـایین‌و گـەلی خۆیـەوە نـەماوە. هەیـشیانە بـە جـۆرێکی تـر بـووە بەدانـەو داویانـەوە، بـە خـەیاڵی خـۆی باسـی ئیسلام دەکا، قسەی خێر بۆ موسوڵمانان دەکا. بەلأم بەقەد سەد دوژمن زیـان لـە ئیسلام دەدەن!

هەنـدێ وا لـەدین تـێ دەگـەن کـە ئـەویش وەك بابەتـەکانی ماتماتیـك برێتییە لەچەند یاساو دەستوورێکی وشك‌و رەق‌و تەق، نە بەشی دڵ‌و نە سۆزو نە تەم‌و مژی تیادا نەبێ!

## ٢٥- کۆکردنەوەو باودان‌و پارسەنگدانەوە:

بنەمای هاوبەشی نێوانی دەقە یاسایی‌یـە نـەگۆڕەکان: ئەوەیـە کـە لـەناو خۆیانـا پێکـەوە بـسازێن‌و دژی یـەکتر نەوەسـتن، چـونکە هـەق لـەدژی هـەق ناوەستێ. گریمان ئەگەر دوو فەرموودە یا چەند فـەرموودەیێ بەدیمـەن پێکـەوە نەدەگونجان، دەبێ ئێمە بەپێی توانا ئەوە نەهێڵین‌و دەقەکان بەشێوەیەکی باش، بە جەمع، یا بە تەرجیح، یا بە تـەئویل جـۆش بـدەین‌و ئـەو ئیشکال‌و کێشەیە چارەسەر بکەین، نموونەی دوو دەقـی بـە دیمـەن جیـاواز، یـا ناتـەبا وەك دێنیـی گۆڕستان بۆ ژنان. دوو جۆرە دەق لەم بابەتەدا هەیە: جۆرێکیان رێگەی پێ نادا، جۆرێکیان رێگەی پـێ دەدا. جا ئـەم دوو جـۆرە فەرموودەیـە لـەم بابەتـەدا ئـاوا کۆدەکرێنەوە، واتـە کـار بەهـەردوو لایـان دەکـرێ لەسـەر ئـەم شـێوەیە: دێنیـی‌و

سەردانی گۆڕستان بۆ ژنان نادروستە هەرکاتێ بوو بەهۆی ڕوودانی بێ شەرعی بەڵام هەرکاتێ نەبوو بەهۆی ڕوودانی کاری ناڕەوا وە مافی مێردیش بەهۆیەوە نەفەوتا ئەوە دروستە. چونکە ژنیش وەك پیاو پێویستیی بەیادی مەرگ هەیە.

قورطوبیو شەوکانی (ڕەزای خودایان لێ بێ) ئاوا بڕیار دەدەن. بەڵام هەرکاتێ دوو فەرموودەی ساغ بەرابەر یەکتری وەستان وە یەکێکیان لەوی تریان بەهێزتربوو، وە کۆکردنەوەیان ئەستەم بوو، ئەوە کار بە بەهێزەکە دەکرێ. ئەوی تریان ئێستی تیادا دەکرێ، زانا گەورەکان لەم بارەیەوە نزیکەی سەد بەڵگەیان دیاری کردووە کە لەم کاتانەدا دەبن بە پارسەنگو باودانی لایەك بەسەر لایەکدا.

## ٣٦- نەسخ، واتە: هەڵوەشانەوە:

فەرموودە لەم بابەتە هەیە هەڵوەشاوە. واتە: مەنسوخە، هەیە: هەڵوەشێنە. واتە: ناسیخە، بابەتی هەڵوەشانەوە پەیوەندی بە زانستەکانی قورئانەوە زیاترە. بەڵام بەداخەوە ڕافە نووسی وا هەیە بە سەدان ئایەتی قورئان، بەیەك ئایەتی تر هەڵدەوەشێنێتەوە. ئایەتێکیان ناو ناوە ئایەتی شمشێر، هەندێ دەڵێن: سەد ئایەتی تری لە ئایەتەکانی قورئان هەڵوەشاندۆتەوە! بەڵام ئەو ئایەتە کام ئایەتەیە، ڕاجیایی تیادایە. شتی وایش جێگەی سەرنجە.

لەڕاستیدا نەسخ هەم لە ئایەتداو هەم لە فەرموودەدا ڕووی داوە. بەڵام برێ موبالەغەی زۆریان تیادا کردووە، بەهەرحاڵ نەسخ بابەتێکی زۆر گرنگو وردە. ئەم جۆرە شوێنانە جێگەی ئەو دەریا بێ پەیانەی تیادا نابێتەوە، ئەوەی لەسەر ئێمەیە پەیڕەوی فەرمایشتی زانا بەڕێزە ناودارە گەورەکان بکەینو بەس!

**٢٧- تێگەیشتن لە فەرموودە لەبەر ڕۆشنایی هۆیەکانی، یا بەپێی ئامانجو مەبەستو تێکەڵییەکانی:**

کاتێ بەجوانیو روونی لە سوننەت حاڵی دەبین، کە ئەم خاڵانە رەچاو بکرێن:

أ- زانینی هۆی تایبەتی فەرموودەکە، یا بایستو بۆنەکەی.

ب- تا چی رادەیێ رشتەکەی بێ گەردو بێ نەنگو ساغو دروستە، پیاوانی رشتەکەی لە گەورە پیاوانی فەرموودە شوناسەکانن. یا مامناوەندیو کەمناون.

جـ- مەبەست لێی تەشریعو یاسا دانانە، یا مەبەست لێی بەیانی رووداوێکی تایبەتییەو بەس.

د- تاچی رادەیێ لەگەڵ یاساکانی زمانو زمانی قورئان دەگونجێ. جا گەرچی رەچاوکردنی ئەم خاڵانە بەهەموو کەس ناکرێ، بەڵام هەموو کەس ئەوەی پێ دەکرێ کە بەبێ شایستەیی تەواو قسە لە هەڵسەنگاندنی فەرموودە نەکات.

کەسێ بەوردی سەرنج بگرێ دەبینێ فەرموودە لە بازنەی کاتو شوێنو بارودۆخو هۆو بۆنەو تایبەتمەندی رووداودا دەخولێتەوە، کەواتە: بڕیاری فەرموودە مانی بە مانی هۆکەیەتی. نەمانی بە نەمانی بۆنەکەیەتی، مەگەر لە دەقو بڕبڕەی فەرموودەکەدا هەمیشەییو بەردەوامیی مەبەست بێ. یا بابەتەکە خۆی لە بڕیارە نەگۆڕاوەکانی ئیسلام بێ، جاران ئازادکردنی بەندە دەبوو بەکەفارەتی تاوان، ئێستاکە لە سایەی خوداوە بەندەو کۆیلە نەماوە دیارە ئەم کەفارەتە بەم شێوەیە جێبەجێ ناکرێ.

لە راستیدا وەك گوتمان ئەمە بە هەموو کەس ناکرێ، شتی وا بە زانای پسپۆڕی هۆشیاری بلیمەتی رۆشنبیری لەخوا ترسی چاو نەترس دەکرێ،

ئەمـەیش کـارێکی سـانایی ئاسـایی ئاسـان نییـە، گـەلێ جاریش ئەنجامەکـەی بـە پێـچەوانەوەی تێگەیـشتنی رەشــە خەڵکەکەومیــە لــە بابەتەکــە، لەبەرئــەوە پێویـستیی بــەدلێریی رۆشــنبیری (شــجاعة أدبیــة) هەیــە، بــەڵکوو زانایــەکی بەجەرگی چاونەترسی دەوێ، کـە لـە گوتنی راستیەکان شـەرمو شـکۆ نـەکا، لـە ئەنجامی جاڕدانی هەق نەترسێ، ئامادەیی تیابێ بۆ خۆ بەخت کردنو فیداکاری لە پێناویی بیرو باوەڕدا، شێخی ئیسلام ئیبنـو تیمییـە کـە مەلایـەکی گـەورەی کــوردی جیهــانی ئیــسلامە، لــەپێناوی بانگــەوازە پیرۆزەکەیــدا، کــەبۆ روون کردنەوەی حەقیقەتی ئیسلام بوو. کەبۆ تەکاندنی تەپوتۆزی زەمانە بوو لەسەر روخـساری نـازداری، تووشـی گـەلێ سـەر ئێـشەو گێـرەو کێـشەبوو، بگـرە هەنـدێ مــەلای زەمانــەی زەمــانی خــۆی بــە گرتنیــشیاندا، چــەند جــارێ حــەپس کــرا. تەنانەت ئەو دەریای زانستە، ئەو مەلا بەرزە نەبەزە تێکۆشەرە کۆڵنەدەرە لـەناو زیندانی تەنگـو تاریکا وەفاتی کرد، بوو بـە شـەهیدی بیروبـاوەڕی هـەقی خـۆی، بەڵام مۆری ئاثارو شوێنەواری پرشـنگداری بـە مێـژووی ئیـسلامەوە هـەتا رۆژی قیامەت دیارە. (هەزار هەزار رەحمەت لە گۆڕی پیرۆزی).

زاناکان (رەزاو رەحمەتی خودایان لێ بـێ) دەفـەرموون: هـۆی تێگەیـشتنی باش لە قورئانو سوننەت ئاگاداربوونی باشە لە هۆو بۆنـەی هـاتنی دەقەکـەیان. دەنــا وەك خەواریجــەکان زانــا دەکەوێتــە هەڵــەی گــەورەوە، کــە ئــەوەتا ئــەو ئایەتانەی کە دەربارەی کافرەکان هاتوونو باسی حاڵی شڕی ئەوان دەکەن، ئەوان دەیـان سـەپاند بەسـەر موسـوڵمانیشدا. هـەزار رەحمـەت لـە دایـكو باوکـت بـێ جــەنابی دوکتــۆر قــەرضــاوی، لەڕاســتیدا ئێــستا زۆر لــە رۆشــنبیرە تونــدڕەوە ئیسلامـییەکان کەوتوونەتە هەمان هەڵەوە، گریمان موسوڵمانێ بەدەم زیکری (لا اله الا الله)وە، گەشە بیگرێو بۆ موبارەکی بڵێ: یا رسول الله! دەڵێن: ئـەرێ وەڵڵا

کافربووی، چۆن هاوار له غەیری خودا دەکەی؟ موسوڵمانینە! ئەوە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز. ئەوە فەرموودەی زۆرو زەبەنی سوننەتی راستو دروست دەفەرموێ: پێناسەی "ئیسلام": (لا اله الا الله محمد رسول الله)یە، کەچی هەندێ زانای رژێمەکان: بانگەوازو جارِ دەدەن: نوێژنەکەر کافرە.

ژنەکەی تەڵاقی نییە، کەمرد دوور له گۆڕستانی موسوڵمانان لەو چۆڵە چاڵێ هەڵ بکەنو لاشەکەی فرێ بدەنە ناوی... نە نوێژ لەسەری دروستە، نەشۆردن، نەکەفن کردن!.

ئەمەی من عەرزتانی دەکەم بەگوێی خۆم له زانایەکی گەورەی وڵاتێکی ئیسلام پەروەرم بیست له رەمەزانی (١٤١٧)ی کۆچیدا، دووجار له بەرنامەیەکی رۆژانەی رادیۆی ئەو وڵاتەوە لێم ژنەوتووە، ئاخر جار بە ژنە پرسیارکەرەکەی فەرموو: "تۆ نوێژ دەکەیتو مێردەکەت نوێژ ناکا، دامەنیشە بەلایەوە. تەڵاقی نەماوە، بچۆ شوویەکی تر بکە!!".

مەبەستی بەندە بەرپاکردنی زیادە دووبەرەکی نییە. مەبەستم راگەیاندنی ئەم مژدەیە: "حەدیثی ژمارە چلو یەك لە تەجریدی بوخاری دەفەرموێ: «يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ شَعِيرَةٍ مِنْ خَيْرٍ». جا سوێندم بەخودا هاکا لافاوی شۆڕشێکی رۆشنبیری ئیسلامی، دڵسۆز بۆ سەرجەمی گەلی ئیسلام کۆتایی بەمجۆرە فەتوا نا مەسئوولانە هێنا، خوا یاربێ ئەمە زۆری نەماوە".

وەکی تر ئێمە بەخۆمان دەڵێین: ئەهلی سوننەتو جەماعەت دەی کەی ئەمە رای زانا گەورەکانی ئێمەیە ئایا ئیبنو تەیمییە وا دەفەرموێ؟ حاشاو کلا. ئیبنو جەوزی وا دەفەرموێ؟ نەخەیر، ئیبنو قودامە وا دەفەرموێ؟ ئەشعەری وا دەفەرموێ؟ نەخەیر نەخەیر. سەحابەکان وایان فەرمووە؟ نەبەخوا، تابیعین

وایان فەرمووە؟ نەوەڵلا. لە سوننەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەتوای وا تۆمار کراوە؟ نە بەقورئان! کەواتە: "انا لله وانا الیه راجعون".

**٢٨- ئێوە خۆتان لەکاروباری جیهانیی خۆتان باشتر دەزانن (انتم اعلم بشؤن دنیاکم):**

لە سیرەتدا داستانێکی جوان هەیە، پاڵفتەکەی ئەمەیە: جارێ لە مەدینە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەبینێ ئەنصارەکان خەریکن باخە خورما موتوربە دەکەن. دەفەرموێ: ئەوە خەریکی چین؟ عەرزی دەکەن: قوربان! ئەوە موتوربەی دەکەین، تا خورمای باش بگرێ. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی لە مەککە گەورە بووە، مەککەیش "واد غیر ذی زرع" شیوو دۆڵێکی بێ مەزراو کشتوکاڵە، لەبەرئەوە پسپۆڕی لە کشتوکاڵ نەبوو، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بە زمین، نەك بە وەحی فەرمووی: "ئەگەر موتووربەیشی نەکەن هەر بەردەگرێ" ئەوانیش وایان زانی کە ئەوە سرووشە، یا فەرمانی ئایینە، ئیتر وازیان لە پەیوەندیکردن هێنا. کەچی لە ئەنجاما بەروبوومی باخەکان ئەو ساڵە باش نەبوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهۆی ئەوەی پرسی عەرزیان کرد: تۆ وات فەرموو، ئێمەیش وازمان هێنا، کەچی وای لێ هات! ئەویش فەرمووی: کەمن ئەم قسەیەم بەزەینی خۆم گوتووە، لەسەر شتی وا گلەییم لێ مەکەن (خۆتان لەکاروباری دنیاتان باشتر دەزانن). ئەمە کرۆکی ئەم باسەیە. کەچی ئێستا هەندێ مەردومی ناشارەزا کەخۆیان بەزانا دەزانن. هەرایەکیان بەرپا کردووە، ئەمەیان کردووە بە مەهانەو بیانگ.. بۆ خۆ دەربازکردن لە بڕیارەکانی شەریعەت. لە بوارەکانی ئابووریو شارستانیو رامیاریو ئەمانەدا، گوایە بە بۆچوونی هەڵەی ئەوان ئەم بوارانەو وێنەی ئەمانە هەموو لە کاروباری جیهانن، پێغەمبەران هیچیان لێ

نازانن. کەواتە ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەرئەوە: کە ئەمانە کارو پیشەو ئیشی ئێمەن، خۆمان پسپۆڕی ئەم مەیدانانەین، ئەوەتا بەئاشکرا پێغەمبەران دوفورموون: "کاروباری جیهان سپێردراون بە خۆتان، چۆنی ئەنجام دەدەن کەیفی خۆتانە" جا ئایا ئەمە راستە؟! کەی ئەمەی ئەوان دەیڵێن وایە؟! بەشێ لە شەریعەت رێکخستنی سیستەمی سەوداو مامەڵەکانە وەك کڕینو فرۆشتنو بەکرێدانو قەرزو سەودای تر، بەسە بۆ بەڵگەی دروستی ئەم بۆچوونە کە درێژترین ئایەت لە قورئانا دەربارەی نووسینی قەرزە.

### ٢٩- سەفەرکردنی ژن بەتەنیا بەبێ کەسێکی خۆیی:

أ- لە صەحیحەیندا دەفەرموێ: حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: "نابێ ژن بەبێ خۆیی (مەحرەم) بچێت بۆ سەفەر".

ب- دیارە کە بایستی ئەم نەیکردنە لەو رۆژگارەدا، کەپڕ لەدزو جەردەو پیاو خراپ بووە. دەگەڕێتەوە بۆ ئەم مەبەستە بەرزە: "لە دیدو بۆچوونی ئیسلامدا ناموسو گیانو سامانی ژنان زۆر عەزیزو بەڕێزن، دەبێ بەهەر نرخێ بێ بپارێزرێن".

دەی لە چەرخێکا کە پیاوی ئازا بەبێ چەكو بەبێ هاوڕێیەکی دلێری وەك خۆی نەتوانێ ماڵەو ماڵ بکا، چۆن عەقڵ دەیگرێ: ژنێ بەتاقی تەنیا، یا لەگەڵ پیاوی نەناسدا، بەپێ، یا بەسواری وشترێ، ملی رێ بگرێو بکەوێتە ئەو دەشتو دەرو چۆڵو بیابانە پڕ مەترسییانە، خۆ ئەگەر زیان لە ناموسو سامانیشی نەکەوتایە، مسۆگەر سەری بەسەلامەتی دەرنەدەچوو، خۆ ئەگەر لە سەرزەنشتی خودایش قوتاری ببوایە لەتانەو بوختانی خەڵك رزگاری نەدەبوو، خۆ ئەگەر لەدزو جەردەیش دەربازببوایە، لە درندەی کێو دەرباز نەدەبوو، لە مارو مێرو گەزندە ئەمین نەدەبوو. بەڵام لەم سەردەمەدا بارو دۆخ گۆڕاوە،

سەفەر بەفڕۆکەو خۆشڕۆ دەکرێ. ژن لەماڵ دەردەچێ هەتا دەگاتە جێگەی مەبەست لەگەڵ کۆمەڵێ مرۆڤی ڕۆشنبیردا دەڕوا، کە لەسەرو ماڵو نامووسی خۆی ئەمین دەبێ. کەس زیانی بۆی نابێ، جا ئەگەر ئافرەتێکی مەرد لە بارودۆخێکی ئاوادا سەفەری دوورو درێژ بکا لەکوێ بەرنەیی کردنی ئەم فەرموودەیە دەکەوێ؟ کەواتە: ڕاستە کە زاناکان دەفەرموون: "بڕیارو حوکم بە بوونو نەبوون لەگەڵ بایستو هۆکەیدا دەسووڕێ". ئەمە لە دێرینیشدا زاناکان ئەم بڕیارەیان داوە، وەك ئەوە هەندێ زانای مەزن دەفەرموون: "دروستە بۆ ژن بەبێ خۆیی‌و بەبێ مێرد، بچێ بۆ حەج، بەمەرجێ لەگەڵ چەند ژنێکی تری بڕوا پێکراودا بچێ! یاخود لەگەڵ کاروانێکی ئەمینداردا بڕوا".

لە فەرموودەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە، کە لەسەردەمی حوکمی ئیسلاما دنیا وا ئەمین‌و هێمن دەبێتەوە، ژنی کەژاوە نشین، لە حیرەوە بەبێ هاوڕێتیی مێردی دەچێ بۆ مەککە واتە: بەبێ ئەوە خۆیی لەگەڵا بێ.

حەزرەتی عائیشەو چەند کەسێکی تر لە دایکانی موسوڵمانان لەسەردەمی عومەردا، لەگەڵ ژنی متمانە پێکراودا، یا لەگەڵ کاروانی ئەمیندا، دەچوون بۆ حەج وەك ئەوە لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەففانو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفدا دەچوون بۆ سەفەری حەج.

جـ- هەر لەم بابەتەیە ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێ:

"پێشەوایانی موسوڵمانان دەبێ لەهۆزی قوڕەیش بن". ئیبنو خەلدوون دەفەرموێ: "پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم فەرموودەیەدا، ئەوەی ڕەچاوکردووە، کە لەو چەرخەدا قوڕەیش بەهێزبوون، کۆمەڵەیەکی یەکگرتووی وایان بووە کە جێنشینی‌و پادشایی بپارێزن، جا کاتێ چەسپا هۆی مەرجبوونی قوڕەیشێتی لەپێشەوادا بۆ ئەوە بووە کە کێشەو بەرە نەقەومێ،

چونكه قورەیش لەو رۆژگارەدا توانیویانە بەهێزی بازووی خۆیان قەوارەی ئیسلام بپارێزن، ئەوكاتە تێ دەگەین كە مەبەست لە قورەیشێتی بەهێزییە، ئەوەیە كە جێنشین بتوانێ كۆنترۆڵی كاروبار، بۆ بەرژەوەندی ئیسلام مسۆگەر بكا، ئیتر لەهەر هۆزێ بێ دەبێ!"

كەواتە: جەوهەری بابەت گرنگترە. نەك رواڵەتی رووتو قووت. دەی خەلیفەیەكی حەبەشی بەهێزی دانای زانای دڵسۆزی گەلی ئیسلام، لەهەموو سەردەمێكا لەپێشترە لە خەلیفەیەكی لاوازی ترسنۆكی قورەیشی! بەهەرحاڵ ئەگەر دەتوانراو كێشەو بەرەی لێ دروست نەدەبوو، با بۆ پابەندبوون بەدەقی فەرموودەكەی حەزرەت خەلیفە پیاوێكی قورەیشی توانای زانای موسوڵمانی چاك بێ، بەڵام بەهیچ حاڵێ نابێ: "قورەیشێتی لەبەر زاتی خۆی بكرێ بەمەرجی جێنشین!"

**٣٠- بەرنامەی یارانو شوێنكەوتوان سەبارەت بەرەچاوكردنی هۆو بایستو بۆنەو هەلو مەرجەكانی دەقەكان:**

مایەی شادیی موسوڵمانی رۆشنبیری ئەم چاخە زێڕینەی بانگەشەی ئیسلامییە. كە یارانو شوێنكەوتوان، لەسەدەی یەكەمدا، یەكەم كەس بوون كە لە روانگەو سونگەو گۆشەنیگای هۆو بۆنەوە لە فەرموودەكان تێ روانیون. هەروا زانای دانای شوێن پا هەڵگری ئەوانیش لەگشت چەرخێكا هەروا بوون!

ئەوەتا یاران لەپاش رەچاوكردنی هەلومەرجی هەموو فەرموودەیێ ئەگەر بۆیان دەركەوتبێ كە ئەو فەرموودەیە بۆ چارەسەری كارێكی تایبەتی كاتیی بووە، وازیان لەخستنە گەڕی رواڵەتكاری هێناوە، وە كاریان بە جەوهەرو گیانی رووداوەكە كردووە. بۆ نموونە: حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) كاتێ خەیبەری ئازادكرد، زەویو زارەكەی دابەش كرد بەسەر تێكۆشەرە

ئازادکەرەکانا، بەڵام عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) سەودای عێراقی دابەش نەکرد بەسەر سوپای ئیسلاما.. بەڵکوو لەدەستی خاوەنەکانیدا هێشتیەوە، وە مڵکانەی لەسەر زەویەکە دانا، هەتا ببێ بە یارمەتییەکی نەبڕاوەی بەردەوام بۆ چیناو چینی گەلی ئیسلام. ئیبنو قودامە (ڕەزای خودای لێ بێ) بۆ ئەمە ئاوا دەفەرموێ: "پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە زەوی‌و زاری خەیبەری دابەش کرد بەسەر سوپای ئیسلاما جێگەی خۆی بوو، ئەو بارودۆخە ئەوەی هەڵدەگرت، چونکە لەسەرەتای ئیسلامەوە کاری وا زۆر زۆر پێویست‌و بەجێبوو، بەرژەوەندی ئیسلام لەوەدابوو، بەڵام لەوەدوا بەرژەوەندی لەوەدابوو: کە زەوی‌و زاری وڵاتە ئازادکراوەکان ببێ بە وەقف‌و تەرخان بکرێ بۆ بەرژەوەندی گشتیی ئیسلام ئیتر ئەوە لەجیاتیی دابەش کردن بوو بە پێویست!"

نموونەیێ تر: لەکاتی پێغەمبەردا سەردەمی دەسپاکی‌و ئەمانەت بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قەدەغەی کردبوو، کە کەسێ هەقی هەبێ بەسەر وشتری بزرەوە. چونکە پێویستی بە پاراستن نییە، خۆی لەو دەشتە لەوەڕو ئاو دەخواو دەژی تا خاوەنی دەیدۆزێتەوە. ئەم حاڵە هەتا سەردەمی عوسمان وا مایەوە. پەیڕەوی ڕێنومایییەکەی حەزرەت لەم بارەیەوە دەکرا، کەس هەقی بەسەر وشتری بزرەوە نەبوو، تا خاوەنەکەی دەیدۆزییەوە. بەڵام لەسەردەمی عوسماندا بارودۆخ گۆڕا، وشتری بزری بێ خاوەن وەك جاران نەدەپارێزرا. زۆرجار دەفەوتا، یا دەدزرا، لەبەرئەوە عوسمان بڕیاریدا: کە مەردوم هەڵی بگرنەوە وە بەپێی شەرع ناونیشانی هەڵ بدەن، دوایی دەفرۆشرێ، ئەگەر خاوەنەکەی پەیدابوو، پارەکەی دەدرێ پێی دەنا هی ئەو کەسەیە کە دۆزیویەتیەوە!

**٣١- ئەو دەقانەی کە لەبارودۆخێکا گوتراون، کە ئـەو بـارودۆخو هـەلو مەرجانە بەرە بەرە بەپێی باوو نەریتی رۆژگار دەگۆڕێن:**

بڕێ دەقی تر هەن، لەسەردەمی حەزرەتدا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەپێی باوو عورفی ئەو کاتە دامەزراون، بەڵام لە چـەرخی ئێمـەدا بارودۆخەکـە بە تەواوی گۆڕاوە، لەبەرئەوە قەیدی نییە ئەگەر ئێمەیش وەك باشانی پێشینان مەبەسـت لـەدەق رەچـاو بکـەینو بایـەخ بـە جەوهـەری بابەتەکـە بـدەین، نـەك خۆمان ببەستینەوە بە پیت بەپیتی دەقەکانەوە.

بـۆ وێنـە: زانـا شـەرعزانەکان بـەپێی دەقـی سـوننەت بڕیاریـان داوە: لـە بابەتەکانی سووددا پێوانە لە دانەوێڵەدا رەچاو دەکرێ، لە زێڕو زیویشدا کێشانە رەچاو دەکرێ، وەك لە دانەوێڵەدا حەدیث دەفەرموێ: " الْبُـرُّ بِـالْبُرِّ كَـيْلاً بِكَيْـلٍ " لەزێڕو زیویشدا دەفەرموێ: "وَزْنًا بِوَزْنٍ".

بەڵام زانای پایەبەرزی حەنەفی مەزهەب ئیمامی ئەبو یوسف (رەحمەتی خـودای لێ بـێ) رای بـە پێـچەوانەی دەقـی مەزهەبەکـەی خۆیـەتی، لەهەنـدێ وردەکاریی ئەم بڕیارەدا، رای ئەم وایـە: "ئـەوەی کـە رەچـاوکراوە لـە دانەوێڵـەدا بایەخ بە پێوانەبێو لەزێڕو زیودا بایـەخ بـە کێـشانەبێ، بڕیارێکـە بـەپێی بـاوی دامـەزراوی نـاو کۆمـەڵی ئـەو رۆژگـارە دامـەزراوە. کـە پێـی دەڵـێن(عـورف) جـا هەرکاتێ باوەکە گۆڕا. وەك ئـەوە خورمـایش وەك زێـڕ بەکێـشانە وەردەگـیرا، یـا دەفرۆشرا. وەك ئەم چەرخەی ئێمە. ئەوە پێویستە کار بەو بـاوە تازەیـە بکـرێ، کـە رۆژگـاری نـوێ سـەپاندوویەتی. بەمـەرجێ گـۆڕان لـە جەهـەوری مەبەسـتە سەرەکییەکەدا روو نەدات. واتە: دروستە خورما بە کێشانەی یەکسان وەربگیرێ، با بەپێوانەیش یەکسان نەبن!

دەی ئەمـەی ئـەبو یوسـف دەیفـەرموێ رێـك بـە پێچەوانەی فەرمایـشتی ئەبو حەنیفەو حەنەفییەکانەوەیە، کە دەفەرموون: "هەرشتێ دەقـی پێغەمبـەر

خۆیی (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەربێ، ئایا پێوانەبێ، یا کێشانەبێ، لەم بابەتی کەمو زیادیی سوودەدا. دەبێ وەك خۆی بمێنێ، با خەڵکیش کاری پێ نەکەنو وازیان لەو یاساو باوە کۆنە هێنابێ!".

بەڵێ: جەوهەری کار مەرجە، رووکاری کار گرنگ نییە بەڵام ئێمەیش کارێکی هەروا ئاسان نییە، نابێ هەر کوتە مەلایەك راست ببێتەوەو خۆی بکا بە ئەبو یوسفو بڵێ: "نحن رجال وهم رجال". مەرجی سەرەکی کۆششکار (مجتهد)و برِشتی برِیاری، پابەندبوونە بەم سێ رەوشەوە:

١- کۆششکار زانای پسپۆرِی لە جەوهەری کار شارەزا بێ.

٢- تەقواکاربێ، مەبەستی ساخ رەزای خودا بێ، زانای بێ تەقوا، قسەی ناخوا. چونکە خەڵك چاو لە رەفتارو کردار دەکا نەك لە گوتار بەبێ کردار.

٣- لە چوارچێوەی جەغزی چوار مەزهەبەکان دەرنەچێ. چونکە بەراستی ئەم مەزهەبانە بناغەیان لەسەر تەقوا دامەزراوە، سوپاس بۆ خوا.

دکتۆر قەرضاوی دەفەرموێ: "لەم بابەتەیە کەلەسەر باوێ دامەزرابێ، کە بەپێی رۆژ بگۆرِێ، ئەوەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو رادە (نصاب)ی بۆزەکاتی دوو دراوەکە (نەقدەین) داناوە، یەکەمیان هی زێرِە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دایناوە لە بیست مسقاڵ زەکات دەکەوێ، کە دەکاتە (٨٥) گرام، دووەمیان هی زیوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دایناوە کە لەدوو سەد درەمی زیوینی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زەکات دەکەوێ، کە دەکاتە (٥٩٥) گرام. ئەمەیش بۆیە وا بووە چونکە لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دینارێکی زێرِ: کە مسقاڵێ بووە، بایی دە درەمی زیوینەی ئەو کاتە بووە، کەواتە: هەردوو ئەندازەکە لە جەوهەردا یەك بوون".

بـەڵام ئێـستا بەرەبـەرە نـرخـی زیـو تـەواو دابـەزیوە، کەواتـە: دەبـێ رادە (نصاب)، یا ئەندازەی زەکات بکرێ بەیەك شت، چونکە هۆش نایگرێ: رادەی زەکاتی سامانی بازرگانی کەسێ بەدوو جۆری بـەرزو نـزم بقـەبلێنرێ. بـۆ وێنـە: بە لالە حەمە بلێین: سامانی بازرگانییەکەت بەزێڕ بایی چل مسقاڵ زێـڕە. واتـە: مسقاڵێکی لێ دەکەوێ، بە زیویش بایی هەزار درەمـی زیـوە، واتـە: بیـستو پێـنج درەمی لێ دەکەوێ. مسقاڵی زێڕ بایی دوو سەد دیناری عێراقی بێو درەمـی زیـو بایی هەشت دینار بێ، لالـە حەمـە (٢٠٠) دینـاری عێراقـی زەکات دەدا، تـا ئێـرە نموونەکـە بێگـەردە بـەڵام ئەگـەر بـچینەوە سـەر سـەرەتای رادە بڕیـاردان، جیاوازییەکی جەوهەری پەیدا دەبێ، رادەی زێـڕ بیـست مـسقاڵە. دەکاتـە: ٢٠ × ٢٠٠ = ٤٠٠٠ دینار، کەچی بەزیو دەکاتە: ٢٠٠ × ٨ = ١٦٠٠ دینار.

لەباری یەکەمدا نیو مسقاڵ زێڕ زەکات دەدا. دەکاتە (١٠٠) دینـار، لـەباری دووەما (٥) درەم زیو دەدا، دەکاتە (٤٠) دینار!

جا ئایا دروستە بە لالە حەمە بلێین تـۆ (١٦٠٠) دینـاری عێراقیـت هەیـە زەکاتی دەکەوێ، بەڵام بە مامە خولە بلێین: هەرکاتێ چـوار هـەزار دینـارت بـوو ئەوسا زەکاتی لێ دەکەوێ!

## ٣٢- سوننەتە لەنێوانی گوتە (لەفظ)و گیاندا، یا لـەنێوانی دیمـەنی دەرەوەو جەوهەری مەبەستدا:

زۆرجـاران پابەنـدبوون بـە روکـاری سـوننەتەوە سـەر دەکێـشێ بـۆ خـۆ دزینەوە لە جەوهەری سوننەتو گیانی مەبەستەکە، وەك لەم نموونەیـەدا روون دەبێتەوە: "توندڕەوە رووکـار خوازەکـان دەڵـێن: سـەرفترە هـەر دەبـێ بـەخۆراك بـدرێ. وەك گـەنمو بـرنجو شـتی وا، دەڵێن: دروسـت نیـە لـە جیـاتیی دانـەوێڵە

بەهاکەی بدرێ بە هەژاران لەباتی سەرفترە، بەڵام پێشەوا ئەبو حەنیفەو زانایانی مەزهەبەکەی دەفەرموون: بەهای خۆراکیش بۆ سەرفترە دەبێ".

گەلێ شەرعزانی تریش هەروا دەفەرموون، وەك عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو کەسانی تریش لە شەرعزانەکانی پێشینان.

بەڵگەی توندڕەوەکان ئەمەیە: گوایە: دەڵێن: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ سەرفترە چەند جۆری خۆراکی دیاری کردوووە، وەك خورماو مێوژو گەنمو جۆ. کەواتە: بۆ ئێمە نەهاتووە کە ئەم سنوورە ببەزێنین کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی دیاری کردووە. چونکە چۆن دەبێ رای ئێمە بە پێچەوانەی دەقی فەرمانی پێغەمبەر بێ؟

بەڵام ئەم برا بەڕێزانە ئەگەر وەك پێویست سەرنجی کرۆکی مەبەستەکە بدەن. دەبینین لەڕاستیدا خۆیان بە پێچەوانەیفەرمانەکەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکەن. گەرچی بەدیمەن پەیڕەوی لێ دەکەن، واتە: بایەخیان بە کوڵۆشی سوننەت داوە بەڵام جەوهەرو کوڕۆکەکەیان فەرامۆش کردووە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە رۆژگاری خۆیدا هەلو مەرجی دەوروبەرو خوازەی رۆژگاری خۆیی رەچاو کردووە، لەو رۆژەدا دانەوێڵە بۆ سەرفترە دەر ئاسانتر بووە، وەبۆ زەکات وەرگریش قازانجتر بووە، چونکە لەو رۆژەدا لەناو عەرەبدا پارە بە دەگمەن دەست دەکەوت، بەتایبەت لەناو دەشتەکیو کۆچەرییەکاندا. بەڵام دانی خۆراك لەباتی سەرفترە شتێکی ئاسایی ئاسان بووە. تەنانەت شەرع وا بڕیاری داوە زەکاتدەر چی خۆراکێکی زۆرە لەوەبدات بەسەرفترە، بۆیە کەشکیش بۆ خاوەن مەڕوماڵات دروست بووە، بەڵام لەم رۆژگارەی ئێمەدا بەتایبەتی لە گەورە شارەکاندا خۆراك کەمتر مامەڵەی پێ دەکرێ، بەڵکوو هەر مامەڵەی پێ ناکرێ. پارەیش زۆرەو وا

لەبەردەستدا، لەگشت لا دەست دەکەوێ. بگرە هەژار لەجەژندا پێویستی بەپارە پترە هەتا بە گەنمو جۆو دانەوێڵە، کەواتە: چی بۆ زەکاتدەر ئاسانتربێو بۆ زەکات وەرگر قازانجتربێ ئەوە بدرێ بە سەرفترە چاکترە، کە ئەویش پارەکەیە. چونکە جەوهەری رێنموونیو رابەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی دەوێ لێمان.

بۆ روونکردنەوە دەڵێین: شاری قاهیرە دە ملیۆن موسوڵمانی تیادایە. دەی ئەگەر بڵێین: دەبێ بەگەنم یا بەجۆ یا بەخورما سەرفترە بدەن، بەو دەستو بردە دە ملیۆن مەن گەنم، یا خورما لەکوێ دەست دەکەوێ؟ دەبێ خەڵکی شارەکان کارو ئیشی خۆیان بەجێ بهێڵنو بچن بۆ لادێکان، بەشوێن دانەوێڵەدا بۆ سەرفترە. دیارە لەکاتی وادا ئێمە دانەوێڵەکە لە عەلافو فەلاح بەگران دەکڕینو دەیدەین بە هەژاران. هەژارەکانیش ناچارن بە هەرزان بیفرۆشنەوە بە عەلافو جامبازەکان! جا ئایا ئەمە راستە؟ کەی ئەمە دەگونجێ لەگەڵ گیانی ئەم دروشمە مەزنەدا: "کار ئاسان بکەن. کار گران مەکەن".

## ٣٣- هۆکار دەگۆڕێ بەڵام ئامانجو مەبەست نەگۆڕن، دەبێ ئەم راستییە لە فامی فەرموودەو سوننەتدا رەچاوبکرێ:

لەراستیدا (دەبێ بەوردی چاوێ بخشێنرێ بە زانستەکانی (ئوصووڵی تەفسیر)و (ئوصووڵی حەدیث) و (ئوصووڵی فیقە)دا. بنەما کۆنەکانو جەوهەری ناوەڕۆکیان بکرێن بە بناغە بۆ بزافی بەگوڕی نوێی ئەم زانستانە لە سایەی خوداوە گەلی کوردی سەرجەم موسوڵمان، سوپاس بۆ خودا، بەدرێژایی مێژوو پتر لە قەوارەی خۆی خزمەتی ئیسلامی کردووە، ئومێدە لە رەحمەتی خوادا لە ئێستاو لە ئایندەدا لەم خزمەتەدا دەستی باڵای هەبێ، نەشەو هیممەت لەگیانی پاکی ئیبنو صەلاحی شەهرەزووریو ئەبو حەنیفەی دینەوەریو ئیبنو

ئەثیر وەربگرێو شەقڵی خامەی پڕ جەوهەری لەڕوپەڕی ئایندەی ئیسلاما وەك لەمەوبەر دیارو ئاشكراو لەبەرچاو بێ".

بەڵێ گەلێ جار گرنگیدان بەهۆكار سەردەكێشێ بۆ چەواشەبوون لە جەوهەری مرازو مەبەست. بزانن هەمیشە سوننەت گرنگیو بایەخ لە پلەی یەكەمدا دەدا بە ئامانجە بەرزە نەگۆڕەكان، وە بەپێی كاتو ساتو هۆكار (وەسیلە)یان بۆ دەست نیشان دەكا. دیارە كە هۆكار بەپێی رۆژگار، بەپێی شوێنو دەوروبەر دەگۆڕێ. جاران خەڵك بەسواری وڵاخ دەچوون بۆ حەج، ئێستا بە خۆشرۆو ماشێنو فرۆكە دەچن بۆ حەج. مەبەست – كە حەجە – وەك خۆی ماوە نەگۆڕاوە، بەڵام هۆكارەكە گۆڕاوە، كەسیش ناڵێ بۆ ئەمە رووی داوە، چونكە گۆڕانی هۆكار بەپێی باوو یاسای رۆژگار كارێكی زۆر ئاساییە، جێگەی رەخنە نییە، بەڵكوو جێگەی پەسنو سوپاسە. چونكە كارە مەبەستەكەی ئاسانتر كردووە. بۆ نموونە: گەلێ كەس كە بەدیمەن پەیڕەوی سوننەت دەكەن، لە بابەتی پزیشكیدا گرنگی بەو گژوگیاو دەرمانانە پتر دەدەن، كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژگاری خۆیدا نواندوونی بۆ چارەسەری نەخۆشی. وەك: رەشكەو عوودی هیندیو رۆن زەیتوونو خورمای عەجوەو دوومەڵان. وەك: ئاو بۆ تادارو كلو سورمەو سینەمەكیو شیرو گمیزی وشتر. وەك: سووتو بۆ زامو فرنیو محەللەبیو شتی وا، وەك: كەڵەشاخ لەخۆگرتنو خوێن بەردانو خۆ داخ كردن. {بڕوانە: تاج/٤، لاپەڕە: ١٩٤-٢١٣ بەكوردی} .

دوكتۆر یوسف قەرضاوی دەفەرموێ: "بەڕای من ئەمە مەعنای وانییە كە ئەم رانومایانە، كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە رۆژگاری خۆیدا، وەك هاندان لەسەرخۆ دەرمان كردنو چارەسەركردنی نەخۆشی ئاماژەی

بۆکردوون، ئەمە واتای وانییە کە ئەم جۆرە شتانەی کە لەو رۆژەدا باو بوون، جەوهەری پزیشکی پێغەمبەری (طبی نبوی)ن و بەس!"

بەلام بەرای من ئەمە بەلگەیە لەسەرئەوە: جەوهەری پزیشکی پێغەمبەری ئەوەیە: لەهەموو کاتو ساتێکا تەندروستیو ژیانی دوور لە ئێشو ئازازی مرۆڤ بەپێی توانا بپارێزرێن، دەشێ مافی ئەوەی پێ بدرێ هۆی حەوانەوەو تواناییو بەهێزیو لەشساغی بەشێوەیەکی رەوا بۆ خۆی فەراهەم بهێنێ. واتای وایە: کە بەکارهێنانی دەرمان بۆ نەخۆش کارێکی رەوایە، دژی باوەڕ بە چارەنووسی خودایی نییە. پێچەوانەی پشت بەستن (توکل) بە خوای گەورە نییە. وەك هەندێ لەخۆیانەوە وا تێ دەگەن هەروا راستە: کە هەموو دەردێ دەرمانێکی هەیە. هەروا ددان نانە بەوەدا: کە دەستووری نەگۆڕی خوا وایە: کە نەخۆشی تەنینەوە هەیە، کەواتە: پارێز شتی چاکە.

پاکیو پوختی لەشو خواردنو خواردنەوەو جلو بەرگو جێگەو شوێنو زمانو دەروونو دەمو دەست کارێکی زۆر پیرۆزە، خواردنو خواردنەوەو دەرمانی بەسوودو هەر کارێ ببێ بەهۆی سەخلەمی لەشو پەروەردەی گیانو جوانی رەوشت پەسەندو رەوایە. کەشتی وا پێویستی بە خۆپاراستن لە پیسیو پۆخڵیو نەخۆشیو دەردو پەتا هەیە. هەروا پێویستی بە خۆپاراستن لە پیسیو پۆخڵیو نەخۆشیو دەردو پەتا هەیە. هەروا پێویستی بە پوخت راگرتنی ژینگە هەیە. کەشتی وا پێویستی بەچەند دەسگاو سیستەمێکی دەست بەکاری هاوچەرخ هەیە.

واتە: مەبەستی سەرەکی لە ئیسلامدا لە بابەتی پزیشکیدا هەوڵدانو تێکۆشانە بۆ دابین کردنی ژیانێکی ئاسوودەی دوور لە ئێشو ئازارو نەخۆشی

بەپێی توانا هەر چەرخ و سەردەم و جێگەو شوێن و حاڵ و مەقامێ بەپێی هەل و مەرجی لە بارابووی خۆی!

نەك بارودۆخی هەزار ساڵ لەمەوپێش ئێستا پیادەبکرێ و بەناوی پزیشکی پێغەمبەرییەوە بسەپێنرێ بەسەر مەردومدا. بەڵێ هەرچی زیانی بۆ سەرو لەش و سامان و ناموس و هۆش و ئایینی مرۆڤ هەبێ، دەبێ یاساخ بکرێ، هەتا نابێ جەستە بۆ خوا پەرستیش شەکەت بکرێ و بڕتێنرێ. هەرچیش لەسەر شێوەیەکی ڕەوا سوودی بۆ یەکێ لەمانە هەبێ پەسەندەو ڕەوشێکی چاکە. ئەمەیە پوختەی پزیشکی پێغەمبەری. کە لەهەموو کات و جێگەو چاخێکا نەگۆڕەو بایەخدارە، نەوەك شەتڵبوون و خۆ توند شەتەکدان بە خودی ئەو جۆرە دەرمان و چارەسەرانەوە کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیانی خۆیدا بۆ هاندان لەسەر بەکارهێنانی دەرمان نواندوویانی.

لەڕاستیدا ئەگەر قورئانی پیرۆزیش بەدەق هۆکارێکی لەبار بۆ مەبەستێکی دیاری، یا بۆ کاتێکی تایبەت دیاری بکا، وەك: وڵاغی بەرزە بۆ غەزا. ئەوە مەبەست ئەوە نییە کە ئێمە هەتایە هەتا خۆمان ببەستینەوە بەو هۆکارەوەو هەنگاوی بەرەوپێش نەنێین بۆ باشترکردنی. ئەوەتا قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ – الأنفال/٦٠﴾. دەی ئایا ئەمە واتای وایە: کە مورابەطەو ڕوو بەڕوو وەستان بەرابەر دوژمنان هەتا ڕۆژی ڕەستا خێزان، هەر دەبێ بە ئەسپ و مایین بێ و بەس؟ چونکە لەو ڕۆژەدا قورئان بەدەق وا دەفەرموێ؟!

خەیر! چونکە سەرجەمی هۆشیارانی شارەزا لە یاساکانی زمان. پسپۆڕ لە ڕۆحی یاساناسی و شەرع شوناسی ئاوا لەم دەقە تێ دەگەن: (باشترین چەکی

هەموو سەردەمێ، چاكترین هۆكاری جەنگ كردنە، لەجێگەی وڵاخی بەرزەی ناو ئەم ئایەتە پیرۆزەیە بۆ ئەو سەردەمە).

هەروەها ئەو خێرو پاداشەی هەیە بۆ خاوەن مایین، هەمان خێرو پاداش بۆ خاوەنی ئەو هۆكارە جەنگیانەی تر هەیە كە بەپێی رۆژ جێگەی وڵاخی بەرزە دەگرنەوە. وەك: زرێپۆشو فڕۆكەو مووشەك، هەروا ئەو پاداشەی: كە بۆ شیرو تیرو پەیكان هەیە، بۆ شەستیرو تۆپو ئەتۆم هەیە، هەروەها.

وا دەزانم دیاریكردنی داری سیواكیش بۆ پاككردنەوەی دەمو ددان لەم بابەتەیە. كە هۆكار شایستەی گۆڕانە، بەڵام مەبەست نەگۆڕو دامەزراوە. بەردەوامیی مەبەستی شەریعەتە، ئامانج (هەدەف) پاكیو خاوێنی دەمو ددانە، كە دەبێ بەهۆی مایەی رەزای خودا، بەڵام ئایا سیواك كردن بەدار سیواك لەزاتی خۆیدا مەبەستی سەرەكی سیواك كردنە؟ یا داری سیواك لەو سەردەمەدا هۆكارێكی لەباربووە بۆ دانیشتوانی دووورگەی عەرەب. بەڵام بۆ ئەم سەدەیە با ئەو هۆكارە فورچەو ماجووم بێ، قەیدی چییە (گەرچی لە باوەڕی مندا فورچەو ماجووم بۆ پێش نوێژ دابەستن عەمەلی نیە چونكە ئەثەری لە دەمدا دەمێنێ - نوری).

هەروەك گەلێ لە شەرعزانەكان بەدەق دەفەرموون: بەگشت شتێ كە ببێ بەهۆی پاككردنەوەی دەمو ددان سیواك كردن دروستە. وەك پەڵاسو لفكەو پەنجەو فورچە. مەزهەبی ئەبو حەنیفە (رەزای خودای لێ بێ) وا دەفەرموێ، چونكە بەڵگەكانی بابەتی سیواك بۆ گشتایەتین، لە (المغنى)دا ئاماژە بۆ ئەم یاسا دامەزراوە گرنگە كراوە: "سیواككەر بەهەرچی سیواك ئەنجام بدا بە ئەندازەی پاكەوەبوونی دەمو ددانی لە سوننەتی ئەم بابەتە دەپێكێ! جێبەجێ كردنی لای




كەمی سوننەت تەرك ناكرێ، بە بیانووی ئەوە كە ناتوانرێ هەمووی، یا زوربەی جێبەجێ بكرێ".

لەسەر ئەم بناغەیە دەرمانی ددان شۆردنو فورچە لەم سەردەمەدا بە تایبەت لە ماڵەوەو لەپاش خەو، بریتی سیواك كردن دەكەوێو هەمان قازانجو خێری هەیە.

هەروا گەلێ نەریتی تریش هەن لە بابەتی یاساو دەستووری سەر خوانو كاتی نانو ئاو نۆش كردنو بەرباوی جوانی خوان دەكەون، وەك لستنەوەی پەنجەو دەوریو هەڵگرتنەوەی پارووی بەرەوەبوو، ئیمامی نەوەوی لە (ریاض الصالحین)دا. كۆمەڵێ لەم بابەتانە باس دەكا، یەكێ لەوانە: خواردنە بەسێ پەنجە، یەكێ تریان ئەوەیە: "ئەگەر پاروویێ بەرەوە بوو، با هەڵی بگرێتەوەو پاكی بكاتەوەو بیخواتو بەجێی نەهێڵێ بۆ شەیتان، كەسێ سەرپێیی تەماشای رووكاری فەرموودەكانی (ریاض الصالحین) بكا: كە بەڵگەی ئەم سەر باسانەن لە لستنەوەی پەنجەو سڕینەوەی بە باسكو قاچو دەستو شتی وا. وا تێ دەگا كە ئەم جۆرە رەوشتانە سوننەتێكی دامەزراوی پێغەمبەرییە. رەنگە رقی لەو كەسانەیش بێ كە بەكەوچكو چنگاڵ شت دەخۆن، یا وا هەست دەكا هەركەس وانەكا بە پێچەوانەی رێگەی رەهبەر كاردەكا، چاو لەخوا نەناسەكان دەكا. بەڵام ئەوەی راست بێ ئەمەیە: مەبەست لەم فەرموودانە بێ هەواییو رێزگرتنی نازو نیعمەتی خوداو پەرۆش بوون بۆ ئەوە كەهیچ شتێ لەنازو نیعمەتی خودا بەفیڕۆ نەدرێ، با دەنكێ برنجیش بێ لەبەینی پەنجەكاندا، یا پاروویێ دەكەوێ نابێ مرۆڤ خۆی بەرۆح زل بزانێو دەعیەی نەیێ كەهەڵی بگرێتەوە، گوایە هەزار پارووی بەرەوەبوو هەڵ دەگرێتەوە، بەڵام ئەم دەوڵەمەندە هەوە جێی

بەوە نییە. دەی هەر پارووێ بەم نیازە تەرك بكرێ ئەوە بۆ رەزای شەیتان تەرك دەكرێ.!

ئەمە پوختەی ئەم بابەتەیە، بێ هەوایی، رێزی نیعمەتی خودا. زیان دوورخستنەوە لە سامان، هەتا ماڵ كەمو زۆری بەفیڕۆ نەڕوا، بەڵام ئەوەی كە دەستی دەلێسێتەوە. بۆ لاسكایی سوننەت، یان لەسەر زەوی دادەنیشێتو پەنجەی خۆی دەلێسێتەوە گوایە بە خەیاڵی خۆی پەیڕەوی سوننەت دەكا، مادام لەگیانی بێ هەواییو سوپاسی بەهرەی خودا دوورە. ئەوە لە جەوهەرو مەبەستی ئاماژەكەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تێ نەگەیشتووە. بەڵام وەك لەپێشەوە ئاماژەمان بۆیكرد: "هەر موسوڵمانێ بە نیازێكی پاك. ساخ بۆ رەزای خودا رەفتارو كردارو گوتارو ئاكاری پێغەمبەر بكا بەسەر مەشق بۆ بەرنامەی ژیانی خۆی ئەوە زۆر زۆر باشە، بەڵكو دەبێ خواناسان وابن، بەڵام لەهەمان كاتدا نابێ ببێ بە كۆسپ لەڕێگەی پێشكەوتنی كۆمەڵگای گشتیی موسوڵمانانىدا. چونكە ئەوەی بۆ ئەوان دەست دەدا، بۆ رەشە خەڵك بە گشتی دەست نادا".

جارێ زانایێ بۆیگێڕامەوە فەرمووی: "رێم كەوتە وڵاتێكی ئیسلامی لە كیشوەری ئاسیا، سەرنجم دا لەسەر ئاودەست بەكۆمەڵ بەردی بچووك خڕ هەڵدراوە. كە لەهۆی ئەوەم پرسی گوتیان: ئەوە لەپاش سەراوكردن خۆمانیان پێ پاك دەكەینەوە. گوایە بەخێرێ بەم شێوەیە سوننەت زیندوو دەكەنەوە!"

دەی ئەگەر ئەمە وایە دەبوو ئەم برا بەرێزانە لەباتی قاڵیو بەڕەو بەرماڵو مافوور چەوو زیخیان رابخستایە لەناو مزگەوتەكانیاندا، نەدەبوو دەرگای مەحكەم بۆ مزگەوتەكانیان بكەن. هەتا مزگەوتەكانی ئەوانیش وەك سەردەمی حەزرەت بێ دەرگا بوایەو سەگەل لەدوا نوێژ تەراتێنی تیا بكردایە! بە بیانگی ئەوەوە كە شتی وا سوننەتە. دەبوو بە پەلكە خورماو دارو پەردوو

سـەربانیان بگرتایـە، نـەك بـە چـیمەنتۆو كۆنكرێـت. دەبـوو لـەباتی گولـۆپ قوتیلـەیان بەكاربهێنایـە، كەچـی مزگەوتـەكانیان كەشـخەو رازاوەو پـڕ قـاڵیو مافوورو گولۆپە!

## ٣٤- پێوانەی مەدینەو كێشانەی مەككە تەواوە:

لە فەرموودەیەكا خۆشەویست ئاماژە بـۆ ئـەیارەی پێوانـەو كێشانە دەكا مەبەست لەوە ئەوەیە: كە موسوڵمانان پابەندی جۆرە ئەیارمیەكی رێكوپێكی بێ فـرووفێڵ بـن، هـەتا بەئاسـانیو بـەجوانی بتـوانن كردارەكـانی سـەوداو مامەڵـەو كڕینو فرۆشتنو قەرزو بازرگانی ئەنجام بدەن، مەبەست ئەوە نییە كە ئەیارەی مەككە یـا ئـەیارەی مەدینـە لـەزاتی خۆیانـا باشـنو كـاركردن پێیـان پەرسـتشو خوار پەرستییە.

## ٣٥- بینینی مانگ بۆ ساغبوونەوەی سەری مانگ:

باسـێ تـر كەبـەر ئـەم بابەتـە دەكـەوێ، ئـەم مەسـەلەیە كـەوا لـەم فەرموودەیەدا: (تا مانگی نـوێ نـەبینن نـە بیكـەن بـە رەمـەزانو نـە بیكـەن بـە جەژن! ئەگەر هەورو هەلا بوو وە هەور بەری مانگی گرتبوو، سیی رۆژی تـەواو دابنێن بۆ مانگی پێشووی). {بڕوانە: تاج/٢/٨١ زنجیرە: ٢٩}.

لێرەدا شەرعزان بۆی هەیە كە بفەرموێ: "لـەم فەرموودەیـەدا مەبەسـت دیاری كراوە، كە گرتنی رۆژووی مـانگی رەمەزانـە سەرانـسەر، بـەبێ كـەمو زیـاد پێ كەل كردن، هۆكارێكی لەباریش لەگەڵ بارودۆخی ئەو رۆژگـارەدا دەستنیـشان كراوە. بۆ گەیشتن بەو مەبەستە نەگۆڕە، كە دیتنی مانگی نوێیە بەچاوی سـەر لەلایەن یەك شایەتەوە یا لەلایەن چەن شایەتێكەوە. ئەم هۆكـارمیش هۆكـارێكی ئاسایییـە. بـۆ هـەموو سـەردەمێ دەسـت دەدا. جـەماوەر بـە ئاسـانی بـەهرەی لێ

وەردەگرن، دیارە کە لەسەردەمی بەختەوەریدا، کە چاخی پێغەمبەرییە، دیتنی مانگی نوێ، بەچاوی سەر بەبێ دووربین‌و تەلەسکوب‌و شتی تری وا، یەکەم هۆکاری ئاسانی ئاسایی لەباری ئەو رۆژگارە بووە، بۆ هەموو کەسێ، لەبەرئەوە فەرموودەکە ئەوی دەستنیشان کردووە بۆ گەیشتن بەو مەبەستە. چونکە نەدەکرا کە لەنەتەوەیەکی بێ سەوادی وەك نەتەوەی ئیسلام لەو کات‌و ساتەدا، داوای کارکردن بە حیسابی فەلەکی لێ بکرێ، بۆ دیاریکردنی هاتنی سەری مانگ، چونکە شتی وا لەو سەردەمەدا بۆ ئەوان کاری نەکردنی بووە! تووشی سەراسێی دەکردن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: "خودا منی رەوانە کردووە، کە ببم بە مامۆستایەکی نەرمۆ نیان، کار ئاسانکەربم. منی بۆ ئەوە رەوانە نەکردووە کە مەردوم تووشی رەنج‌و سەراسێ بکەم‌و باری سەرشانیان قورستر بکەم".

دەی باشە ئێمە دەڵێین: هۆکار شایانی گۆڕانە، لەزاتی خۆیدا مەبەست نییە. دەی کەوایە هەرکاتێ هۆکاری تری باشتری لەبارتر پەیدابوو، بۆ گەیشتن بە ئامانج لەم فەرموودەیەدا، کە بەشێوەیەکی وابێ: هەم هەڵەی کەمتر بێ، هەم ئاسانترو راستتر بێ، هەم لەتوانادا بێ ئیتر بۆ دەبێ خۆمان شەتڵ بکەین بە هۆکارە کۆنەکەوە. کەخۆی لەزاتی خۆیدا مەبەست نییە، پابەندبوون پێیەوە پەرستن نییە. بۆ دەبێ خۆمان لە ئامانجی سەرەکی فەرموودەکە هەڵە بکەین؟!

بێگومان ئەمرۆ شۆڕشی زانست سەر رووی زەوی گرتۆتە بەر، لە سایەی خوداوە گەلی ئیسلام رۆشنبیرە، پڕە لەزانای پایە بەرز پڕە لە پسپۆڕانی لێهاتووی لێزان، زانای ئاسمانی‌و زەمین ناس‌و دەریا ناسی وامان هەیە، پسپۆڕن لەسەر ئاستی جیهانی. وەکی تریش ئێستا وەك جاران نەماوە، ئەمرۆ مرۆڤ لەسەر رووی گوێ مانگ گەشت‌و گوزار دەکا، نموونەی بەردو چەوو خاك‌و

خۆڵی سەرمانگی هێناوە بۆ سەرزەوی، گەلێ بەئاسانی دەتوانرێ: سەری مانگی نوێ زۆر بەوردی دیاری بکرێ، بگرە دیاریکردنی سەری مانگی تازە بە تەلەسکۆبو هۆکاری ئاسمان شوناسی نوێ گەلێ راستترو بەهێزترە لەبینینی مانگی نوێ بە چاوی سەر لەلایەنی چەن کەسێکی کەمەوە، کە دوور نییە تەنکە هەورێ، یا تارماییەکیان لێ بووبێ بە مانگ. ئەوەی گومانی تیادا نیە هەرکاتێ بە تەلەسکۆبو شتی وا، چەسپا کە مانگی نوێ لەپاش نوێژی خەوتنان، بەپێی کاتی بەغدا لەدایك دەبێ، ئەوە هەرکەسێ لافی ئەوە لێ بدا کە ئەو ئێوارەیە لە بەغدا مانگی دیوە، ئەوە درۆیەکی پەتی دەکا، هۆشی ساخو بەلگەی راستو دروست بەدرۆی دەخەنەوە، گەرچی قازیی لەسەر شایەتیی ئەویش بڕیاری هاتنی مانگی نوێ دەربکا.

چونکە ئەم هۆکارە تازانە لەچاو ئەو هۆکارە کۆنانەدا هەر خوایان یەکە، بەلگەیەکی بێ هەڵەی بێ فڕوفێڵ، لەهەمان کاتا زۆر بە ئاسانی دەتوانرێ رۆژانی رەمەزانو رۆژانی جەژنو بۆنە پیرۆزە ئیسلامییەکان یەك بخرێن، لەگشت وڵاتو نیشتمانی ئیسلامیدا پێکەوە رۆژوو بگیرێ یا جەژن بکرێ، دەتوانرێ چارەسەری ئەم پەرتیو سەرگەردانییەی ئێستا هەیە بکرێ، چونکی ساڵی وا هەیە جەژن لە وڵاتێ تەواو دەبێ ئەوسا لە وڵاتێ تر دەست پێ دەکا. رێکەوتووە لەشوێنێ پێنج شەممەیان داناوە بەسەری مانگ، لەشوێنێ تر هەینی لە جێگەیەکی تر شەممە! یا فەرقی رەمەزانی جەزائیر لەگەڵ پاکستان سێ رۆژە! دەی شتی وا نە دین پێی خۆشە، نەهۆشی ساخ پەسەندی دەکا، نە زانست پشتگیری لێ دەکا، ئەمڕۆ رۆژی یەك دڵیو یەکگرتنو یەککەوتنە. سەرەڕای ئەومیش هەق یەکەو نابێ بەدوو. کەواتە ئەم چەند سەری مانگانەیش کە بڕیار دراون هەر یەکێکیان راستە، ئەوانی تریان هەڵەیە، لەگەڵ رەچاوکردنی إختلافی

مطلعدا، لەڕاستیدا ئەمڕۆ حیسابی فەلەکی باشترین هۆکارە بۆ ساخ کردنەوەی سەری مانگ، کەواتە: دەبێ بەقیاسی ئەولا کار بەم هۆکارە نوێیە بکرێ، چونکە لە شوێنێ شەرع ڕێگە بدا مەبەستێ بە هۆکارێکی نزمتر ساغ ببێتەوە، کە وەك بەچاو بینین بێ لەم مەسەلەی بەردەستماندا، کە هەڵەگرێ بە هەڵەدا بچێ، دەی لە شوێنێ شەرع ڕێگەی هۆکاری وابدا، ئیتر چۆن ڕێگە لە هۆکارێکی چاکتری بێ هەڵەتر دەگرێ، کە لەسەدا سەد مەبەستەکە مسۆگەر دەکا، لەهەمان کاتا جیهانی ئیسلامیش لە گێژاویی فرە جەژنی ڕزگاری دەبێ. مامۆستای فەرمووده زانی گەورە، عەللامە شێخ ئەحمەد شاکر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەساڵی (١٩٣٩)دا دەفەرموێ: "کارکردن بەحیسابی فەلەکی، لەم سەردەمەدا، بەپێی دەقی سوننەت خۆیەتی" وە لەسەر ئەم شێوەیە ئەم بڕیارە ساخ دەکاتەوە: "بڕیاری چەسپاندنی سەری مانگی نوێ، بەهۆی چاوی سەرەوە، بایستەکەی لەناو سوننەتدا بەدەق گوتراوە: انا امە امیە ". کە بەوردی سەرنجی دەقی فەرموودە سەر بەڵگەکانی ئەم مەسەلەیە دەدەین ئەمەمان بۆ روون دەبێتەوە. بۆیە ئێستا ئێمە کار بەدیتن بەچاو دەکەین‌و کار بە زانستی ئاسمان شوناسی ناکەین. چونکە لەم سەردەمەدا نەتەوەی ئیسلام، گەلێکی بێ سەوادی نەخوێندەوارن، لەبەرئەوە ناتوانن بەهۆی زانستی ئاسمان شوناسییەوە، هاتنی مانگی هەیفی (شەهری قەمەری) دیاری بکەن، دەی ئەمە بەڵگەی ئەوەیەو واتای وایە: کە هەرکاتێ نەتەوەی ئیسلام ڕۆشنبیر بوون، زاناو خوێندەواری باشیان تیا پەیدابوو، کە بتوانن بەحیسابی فەلەکی هاتنی مانگی نوێ بسەلمێنن، ئیتر ئەو بایستە نامێنێ بۆ دیاری کردنی سەری مانگ بەهۆی بینین بەچاو، دەی ئەوەتانێ سوپاس بۆ خوا ئەمڕۆ نەتەوەی ئیسلام لە زانستی ئاسمان شوناسیدا زۆر پێشکەوتووە، ئەم زانستەیش ئێستا بووە بە زانستێکی

بەرێزی بەسوودی رێكوپێكو یاساو دەستووری دامەزراوی خۆی هەیە. كە بەپێی چەند حەقیقەتێكی زانستی تەواون، وەك جاران نەماوە كە پیاوی فێڵبازو فاڵچیو حیسابكەر لافی غەیبزانی پێوە لێ بدەن!

بەڵێ ئەمڕۆ رۆڵەكانی ئیسلام، سوپاس بۆ خودا، زۆر بەوردی دەتوانن بەپێی زانستی ئاسمان شوناسیو ئامێری فرە پێشكەوتووی تازەوە، یەكەم چركەی سەرەتای مانگی نوێی هەیڤی دیاری بكەن. وە ئەمە راستەقینەیەكی بەڵگە نەویستە، خۆ لێ گێل كردنی ئەوپەڕی گێلییە. كەواتە بەلایەنی كەمەوە دەبێ ئێمە كار بەیەكێ لەم دوو یاسایە بكەین: بەهۆكاری ئاسمان شوناسی یا بەبینینی چاو، سەری مانگی تازە دیاری بكەین، واتە: بەپێی هەلومەرجی گونجاو كار بەهەردوو لا بكەین. دووەم: ئەگەر بەپێی حیسابی فەلەكی نەدەگونجا كە مانگ ببینرێ دەبێ قازی شایەتی لەكەس لەم بارەیەوە وەرنەگرێ، چونكە بەڵگە بەپێی شەرع، كاتێ باوەڕو كاری پێ دەكرێ كە هەستو هۆشو شەرع بەدرۆی نەخاتەوە، دەی لەباری وادا هەستو هۆش شایەتی وا رەدد دەكەنەوە. ئیمامی سوبوكی (ت٧٥٦هـ) كە یەكێكە لە كۆششكار (مجتهد)ەكانی مەزهەبی شافیعی لە فەتواكانیدا باسی ئەوە دەكا: "ئەگەر ژمارە گەریی (حیسابگەری) دژی رێ تێچوونی بینین بوو، بەچاوی سەر، ئەوە گەرەكە لەسەر قازی كە شایەتیی شایەتەكان وەرنەگرێ." سەبوكی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: "چونكە لەكاتی وادا ژمارە گەری حیسابی فەلەكی – سەر بەڵگەیەكی بەڵگە نەویستە. بڕیارەكەی راستەو بەبێ گومانە، بەڵام قسەی شایەتەكان هەواڵە، هەواڵیش هەڵدەگرێ راست بێ، هەڵ دەگرێ درۆ بێ. كەواتە لەو جۆرەبەڵگانەیە كە گومانی هەڵەی لێ دەكرێ. دەی بەڵگەی گومانیی چۆن بەڵگەی بەڵگە نەویست رەت دەكاتەوە، چ جای ئەوەی پێش ئەو بخرێ؟!"

مامۆستا شاكیر دەفەرموێ: مامۆستا شێخ مستەفای مەراغی كە شێخی زانكۆی ئەزهەری شەریف بوو، كاتێ سەرۆكی دادگای باڵای شەرعی بوو، رای وەك رای ئیمامی سەبوكی وابوو (رەزاو رەحمەتی خودا لەهەموو لایێ بێ). هەروا دەفەرموێ: ئەم مەسەلەیە بەر ئەو یاسا ئوصوولییە دامەزراوە دەگەوێ كە بڕیار دەدا: بڕیار (حوكم) بە بوونو نەبوون (نەفیو ئیثبات: وجوودو عەدەم) لەگەڵ هۆ (عیللەتە)كەیدا دەسووڕێ".

## ٣٦- جیاوازی لەنێوانی حەقیقەتو مەجازدا لەفامی فەرموودەدا:

دیارە كە زمانی عەرەبی زۆر گرنگیو بایەخ دەدا بەرەوانبێژیو بە وشە ئارایی، زمانێكی بەهێزی بە پێزی دامەزراوە، لە بەركارهێنانی دەستێكی باڵای هەیە. وەك لەزانستی رەوانبێژیدا دەفەرموێ: "مەجاز – واتا: واتا گۆڕی: پێچە – لە قسەی راستەقینە باشتر مەبەست دەگەیەنێ". پێغەمبەری نازداریش (دروودی خودای لەسەر بێ) باشترین رەوانبێژە، كە پیتی (ضاد) بەسەر زمانیدا هاتبێ: كە بەبێ گومان فەرمایشتەكانی هەمموو رەوانو جوانو نایابو نەستەقو دانەسقەن، وەك ئالاَ! لەبەر باڵای جوان تێك ئالاون! لەبەرئەوە فەرموودە نازدارەكانی وەك گوڵزاری لالەزارو گوڵشەنی ناو مێرغوزار، پڕن لەم تەعبیرە جوان جوانانە: مەجازو تەعریضو كینایەو حەقیقەت. كە ئەم جۆرە دەربڕینانە زۆر بەباشی مەبەست دەگەیەنن. لەم شوێنەدا مەبەست لە مەجاز ئەم زاراوانەیە: مەجازی لوغەوی (پێچە زمان)و مەجازی عەقڵیو، ئیستیعارەو، كینایەو، ئیستیعارەی تەمثیلیەو، هەر دەربڕینێ كە وشە یا رستە لە واتای راستەقینەی یەكەم جاری خۆی لابداو بیبڕێ بەسەر واتایەكی تردا، بەهۆی نیشانەیش بەڵگەیەكی لاوەكییەوە، نیشانەیش لەم بابەتەدا دوو جۆرن: نیشانەی زاریو نیشانەی باری (قەرینەی مەقالیو حالی).

لەم بابەتەیە ئەو جۆرە قسانەی کە دەیان دەنە پاڵ: گیانلەبەرانو مەلو مۆرو دارو بەردو کوچك وەك دەڵێن: بە بەزیان گوت: ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ گوتی: دەچم خوارو خێچی راست دەکەمەوە! واتە: چرچو لۆچی لەش کە بەهۆی لەرو لاوازییەوە پەیدابووە پڕی دەکەمەوەو نەنگەکانی جەستە دەشارمەوە. بەکوردی دەڵێن: کراسێ گۆشت لەهەزار شایەت باشترە! وەك ئەم گفتوگۆیەی تر: دار دەڵێ بە بزمار: بۆ کونم دەکەی؟ دەڵێ لەوە بپرسە کە دام دەکوتێ! پێشەوا راغیبی ئەسفەهانی (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: هەرکاتێ قسەو باسو گفتوگۆ، بۆ رازانەوەو بایەخداری. نەك بۆ درۆو هەوالگوزاری، لەسەر شێوەی وا نەستەقو سەر مەشق دامەزرا. ئەوە بەوە نابێ بەدرۆ. لەراستیدا ئەو جۆرە قسەیە دادەنرێ بەراستو دروست، بۆیە کەسانێ کەخۆیان لەدرۆ دەپارێزن لە قسەکردندا خۆ لەقسەی وا ناپارێزن. وەك ئەم داستانە فرە جوانە: شێرێكو گورگێكو رێوییەك دەچن بۆ راو، گۆرێكو ئاسکێكو کەروێشکێ راو دەکەن، شێرەکە بە گورگەکە دەڵێ: ئادەی بەشی بکە. دەڵێ: خۆی بەشکراوە. دەڵێ: چۆن؟ دەڵێ: گۆرەکە بۆ تۆ، ئاسکەکەش بۆ من، کەروێشکەکەیش بۆ رێوییەکە! شێرەکە هەڵمەتێکی بۆ دەبا، خەڵتانی خوێنی دەکا، دەڵێ: من گۆشتی کەرەکێوی بخۆمو جەنابت گۆشتی مامز! ئەوجا بە رێوییەکە دەڵێ: ئادەی تۆ بەشیان بکە. دەڵێ: گۆرەکە بۆ قاوەڵتوونت، ئاسکەکە بۆ نیوەڕۆژەت، کەروێشکەکەیش بۆ شێوی ئێوارێت! دەڵێ: ئەمە کێ ئەم دابەش کردنەی فێرکردی؟ دەڵێ: ئەو قاتە رەنگ ئەرخەوانییەی کەوا لەبەر مام گورگا؟ "دەفەرموێ: زۆر لە راڤەکەرانی قورئان دەفەرموون: ئەم ئایەتە لەم بابەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ – الأحزاب/٧٢﴾." بەڵێ زۆر جاران

بەناچاری دەبێ فەرمایشتەکە ببڕێ بەسەر پێچەو مەجازدا، دروست نییە مەبەست لێی واتا راستەقینەکەی بێ، دەنا دەکەوینە گێژاوی کێشەو بەرەی زۆری ناهەموارەوە.

جارێ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ژنەکانی فەرموو: "ئەوەتان لەپاش مەرگی من زووتر دەگاتەوە پێم کە باسکی درێژترە!". هاوسەرەکانی وا تێگەیشتن کە مەبەستی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) باسک درێژی بە راستییە، لەبەرئەوە بەچڵێ قامیش باڵی خۆیان پێوا. تا بزانن کامیان باڵی درێژترە لەوانی تریان، بەڵام دوایی کە زەینەب یەکەم هاوسەری بوو کە لەپاش خۆی مرد، حاڵی بوون کە مەبەست باسك درێژیی کاتی خێرکردنە. چونکە زەینەب زۆر خێرکەر بوو، سەرو مڕ بەدەستی خۆی کاری دەکردو هەرچی پەیدا دەکرد دەیکرد بەخێر. (رەزاو رەحمەتی خوا لەگشت هاوسەرەکانی پێغەمبەر بێ).

بەڵێ: ئەم جۆرە تەعبیرانە لە قورئان‌و سوننەتدا هەن، وەك ئەوە عەدی کوڕی حاتەم لە مەبەستی ئەم ئایەتە بە هەڵە تێ گەیشت، کە دەفەرموێ: ﴿حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ – البقرة/١٨٧﴾ وا تێ گەیشت کە مەبەست پەتی رەش‌و پەتی سپییە، تا لە پێغەمبەری پرسی، فەرمووی: مەبەست سپیدەی بەیان‌و تاریکی شەوە. لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا دەفەرموێ: "جا کاتێ بەندەی من گەیشتە ئەو پایەیەکە ببێ بە خۆشەویستی من، ئیتر خۆم دەبم بەگوێ‌و چاوو دەست‌و پێ بۆی". {ریاض الصالحین/١/١٣٢/١ زنجیرە: ١١}.

موعتەزیلەکان، وەك پیشەی هەمیشەیان، لەسەر ئەم جۆرە تەعبیرو فەرمایشتە بەرزو نایابە ساخانە، گێچەڵ بە فەرموودە شوناسەکان دەکەن‌و، بە

هاشەو هووشەی بێ سەروبەر، بە ئەقڵە بۆری خۆیان کێشەو بەرە دروست دەکەنو، دەڵێن: چۆن شتی وا دەدرێتە پاڵ خودا، شتی وا ئەوە دەگەیەنێ کە خودای پەروەردگاریش وەك دروستکراوەکانی خۆی دەستو پێو ئەندامو گۆشتو ئێسکی ببێ. کە شتی وا بەڵگە نەویستە کە نیسبەت دانی لەخوا ناشایستەیە " لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ".

پێشەوا ئیبنو تەیمییە (رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێ) ئاوا بەرپەرچی ئەم رەخنە پووچە دەداتەوە: ئەمە نموونە هێنانەوەو مەعقوول لە مەحسووس چواندنە: بە مەبەستی روون کردنەوە، نەك بە مەبەستی چەسپاندنی یەکسانی لەنێوانی ئەم نموونانەدا، مەبەست ئەوەیە: هەرکەسێ لە فەرمانبەری منا خێرابێ، لە پاداشتدانەوەیدا من لەو خێراتر دەبم، بەڵام یاخوا لاسار ئاڵای سەرپێچی هەڵ نەکا، دەنا بەهیچ چارناکرێ، مەگەر خوا بۆ خۆی دەمکوتی بکا.

جێگەی داخە ئەمڕۆ، بە ژمارەی نوێژخوێنەکان لە مزگەوتەکان مەزهەبی جیاجیا هەیە، جاران مەزهەب چوار بوو، ئێستا یەك ملیار زیاترە!! – نوری.

**٣٧- هەندێ فەرموودە، لە بابەتی مەجاز، جۆرە کێشەیەکیان بۆ بڕێ رۆشنبیری هاوچەرخ دروست کردووە:**

وەك ئەم جۆرە بابەتانە کەوان لەناو فەرموودەی راستو دروستا: هاوین هەناسەی گەرمی دۆزەخە، زستانیش هەناسەی ساردی ئەوە، گفتوگۆی رەحەم لەگەڵ خودداو داوین گرتنی خودا لەلایەن خزمایەتییەوە، یا کردنی مردن – کە عەرەضەو ماددەو جەوهەری نییە بە بەرانو سەربڕینی لە قیامەتا بە بەرچاوی خەڵکی بەهەشتو خەڵکی دۆزەخەوە، یا کێشانی کرداری بەندە بە تەرازوو، یا رۆیشتن لەسەر پشتی پردێ کە لەموو باریکترو لە شمشێر تیژتر بێ!

هەروا زۆر شتی تری لەم بابەتە. چونکە ئەگەر ئەم جۆرە فەرموودانە ببڕێن بەسەر حەقیقەتی لۆغەویدا، سەر لەخەڵك دەشێوێ، هەزارو یەك كێشەو بەرە دروست دەبێ، لەبەرئەوە دەبێ بەپێی كاتو جێگە، بەپێی بارو شوێن ببڕێن بەسەر مەعنای مەجازیدا، هەتا كێشەكە حەل ببێو رووی راستی روون ببێتەوە!

جالەهەر شوێنێ كێشەیەكی وا هەبوو، نابێ كەسی ناشارەزاو ناپسپۆڕ خۆی بكا بە عولەو، بە سمی گاجووت گوڵشەنو گوڵزار گیرەو شەنو كەو بكا. بەڵكوو كورد گوتەنی: نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ گۆشت فرۆش! دەبێ ئەو جۆرە فەرموودەیە ساخ (تەئویل) بكرێ، لەبەر رۆشنایی رەچاوكردنی ئەم خاڵانە:

١- هۆیەكی رەوای هۆشی یا هەستی، یا شەرعی، یا واقیعی هەبێ بۆ ساخ كردنەوەكە. تەئویلی بەبێ هۆ پووچو پڕوپووچە، ئەو هۆیە بەڵگە بێ لەسەر ئەوە كە مەبەست لەو وشەیە، یا لەو رستەیە، یا لەو قسەیە حەقیقەت نییە، بەڵكوو مەبەست لێی یا پێچەیە، یا دركەیە (كینایەیە) یا لێچواندنو نموونە هێنانەوەیە بۆ زیادە روون كردنەوە. وەك ئەوە لەو شوێنەدا هەستو هۆش بە ئاشكرا، یا شەرع بەڕوونی رێگەی حەقیقەت نەدا. وەك ئەندام دانە پاڵ خوا، هۆش شتی وا ناسەلمێنێ. چونكە سەردەكێشێ بۆ كەمو كوڕیو نوێباویی خودا. شەرعیش بەبێ پێچو پەنا بە زمانێكی پاراوی رەوان دەفەرموێ: (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ!).

٢- گرنگو مەبەست لە ساخكردنەوەدا ئەوەیە ئەو جۆرە داڕێژگە رەوانبێژانە ئەبن بە مایەی نائارامیو بەرپاكەری ئاژاوەی ئایینی بۆ خوێنەرانو بیسەرانو موسوڵمانانو خەڵكان، ئیتر با بەچەن شێوەی جیا جیاش تەئویل

بکرێن فەیدی نییە. هەرکەسێ هەر ساخ کردنەوەیەکی بەدڵە ئەوە کەیفی خۆیەتی، بە مەرجێ بە پێی یاساکانی ساخکردنەوە بێ.

٣- تەئویلو ساخ کردنەوە بەبێ پێویست، هەروا تەئویلو ساخ کردنەوەی بەزۆرە ملێ یاساخو نا بەجایەو بێ بایەخیشە.

٤- بڕینی وتار بەسەر حەقیقەتدا، لەگەڵ هەبوونی نەهێڵی ئەقڵی، یا شەرعی، یا رووداوی، یا زانستی، شتی وایش رێك وەك تەئویلی بەبێ پێویست نابەجێیە، پووچەڵە، پووچە.

## ٣٨- رێگەنەدان بە بەکارهێنانی پێچەو مەجاز زۆرجار سەردەکێشێ بۆ کێشە:

بەڵێ رەتکردنەوەی بابەتی مەجاز دەبێ بە دەروازەیێ بۆ ئاژاوە. بەتایبەتی بۆ کەسانی هۆش پەسەند (عەقلانییەکان) کە ئیسلام فێری ئەم یاسا راستو دروستەی کردوون.

"قەت قەت دەقی رۆشنی شەریعەت لەگەڵ برِیاری هۆشی ساخدا دژی یەکتر نابن!" لەبەر رێگرتن لەم جۆرە مەترسییە دەبێ بەهەر نرخێ بووە، فەرموودەی ساخ ئایەخو بێ بایەخ نەکرێ، هەتا مەودای ساخ کردنو ساخکاری (تەئویل) هەبێ ساخ کاری بکرێ، هەر چار نەبوو، فامی تەواوی واتای هەواڵەی زانستی خودا بکرێ. وەك پیتە پارچە پارچەکانی سەرەتای هەندێ لە سوورەتەکانی قورئان کە زوربەی راڤەنووسەکان لە بارەیانەوە دەفەرموون: (الله أعلم بمراده) لەکاتی وادا با بڵێین: فەرمایشت فەرمایشتی پێغەمبەری سەرورە. لەسەر چاوو لەسەر سەرە بەدوورە لەکێشەو بەرە، فامی تەواوی هەواڵەی زانستی خوداو پێغەمبەرە.

برِیَ دەربڕین (تەعبیر)و وشەو فەرمووده باسی جیهانی نهێنی دەکەن: کە ئەم جیهانە وەك هەموومان دەیزانین یاساو باوو رێو شوێنی خۆی هەیە. کە جیان لە یاساکانی جیهان، وەك ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: "لەناو بەهەشتا لەشتی جیهان بەس ناو هەیە".

لەڕاستیدا ئێمە دەبێ: ئەو راستەقینەیەمان لەبەرچاو بێ: جیهانی نهێنی: کە ناودارە لە زاراوی شەرعا بە عالەمی غەیب، کە ئەم جیهانە وا لەپشت پەردەی ماددەوە، هۆشی ئێستای ئێمە نەهەستی پێ دەکا، نە پەیی پێ دەبا، نە سەری لێ دەردەکا، چونکە هۆشی ئێمە لەم جیهانەدا بەم لەشانە پێوەندکراوە، کەوان لەسەر زەوی، بگرە هۆش نەك هەر پشت پەردەی مادده دەرك ناكا بەڵکوو زۆر لە راستەقینەکانی ماددەیش دەرك ناكا، کەوا لەبەر چاو، ئەوەتا ئێمە ئەم هەمکە شتگەلە دەبینین، یا هەست پێ ئەکەین، هەتا لەم رۆژگارەدا هەست بەوە دەکەین کە مادده دەگۆڕدرێو دەبێ بە وزە، وزەیش دەگۆڕێو دەکرێ بە مادده. بەڵام کەسمان نازانین کە چییەتی مادده، یا وزە، چییە؟

لەڕاستیدا وشەی ماددەو وزەو هێزو شێوەو جەوهەرو سوورەتو هەیوولا. ئەمانەو وێنەی ئەمانە، چەند زاراوەیەکی دروستکراون هەتا لە راستەقینەکان نزیکمان بکەنەوە. دەنا خۆیان لەزاتی خۆیاندا حەقائق نین، راستە کە حەقائیقی ئەشیا ثابیتەو هەیە. بەڵام چییەتی ئەو حەقائیقە بێجگە لەخودا کەس نایزانێ. کەواتە: باش وایە بۆ مرۆڤ کە بەبێ منجە منجی زۆرو بەبێ گێرەو کێشەو بگرەو بەردە. ئیمان بە نهێنی (غەیب) بهێنێو باوەڕ بە فەرمایشتی ئایین، بەبێ چەنو چوون بکا. باوەڕ بەخودا بکا، کاری باش ئەنجام بدا، ئینجا ئەوەی لەجیهانی نهێنی‌دایە، بیداتە دەست خودا، کەخۆی زانایە بەنهێنی‌یەکان، رەنگبێ بەم رەنگە لەڕۆژی قیامەتا سەرفراز ببین!.

بڕێ لەدەستە سەرلێشێواوەکان هەر فەرموودەیێ ڕێك نەکەوێ لەگەڵ مەبەستە نارەسەنو مەزهەبە چەوتەکەی خۆیاندا ئایەخی دەکەن، بە مەهانەی ئەوە کە گوایە: ئەو فەرموودانە دژی هۆشی ساغن، گوتەی بێ بەڵگەن، وەك ئەوە باوەڕیان نییە بە سزای ناو گۆڕ، بە پردی سیراتو بە تەرازووی کێشانی خێرو شەڕو، بە بینینی خودا، یا بەو فەرموودەیەی کە باسی دوو باڵەکەی مێش دەکا، یا زۆر فەرموودەی تری لەمبابەتە، کە هەموویان وان لە سوننەتی راستو دروستدا. لە گەڵێ جار تانەیش لە فەرمووده گێڕەوەکانو لە سەحابەکانو لە تابیعینو لە فەرمووده شوناسە گەورەکان دەدەنو، رەخنە لە کتێبە گەورەکانی شەریعەتو سوننەت دەگرن. ئەم هەمکە بێ وێڵیو گێرە شێوێنیو ئاژاوەیە بەرپا دەکەن، تەنیا لەبەرئەوە کە ئەو فەرموودانە ڕێك ناکەون لەگەڵ مەزهەبە دەست هەڵبەستەکەی ئەواندا، گەلێ جار لەبەرچاوی رەشە خەڵكو عەوامەکان، زۆر بەبێ رێزی، فەرمایشتی گەورە پیاوانی ئیسلام لەبارەی شەریعەتو سوننەتەوە رەت دەکەنەوە، هەتا نەتەوەی ئیسلام لە سوننەت بتەکێننەوە. گوایە بە خەیاڵی خۆیان دەڵێن: ئێمە بەس ئەقڵو قورئانمان بەسە بڕوا بە غەیری ئەم دوانە ناکەین!

بڕێ لەم بیدعەتکارانە دەڵێن: هەرکەسێ بڵێ: پردی سیرات هەیە، یا تەرازوو هەیە، یا حەوزی کەوثەر هەیە، قسەیەکی نابەجا دەکا، بە پێچەوانەی هۆشە. ئەم جۆرە شتانە ئەقڵ نایانگرێ! دەڵێن: جارێ لە یەکێ لەمانە دەپرسن: ئەگەر کەسێ باوەڕی بە بینینی خودا هەبێ، پێی کافر دەبێ؟ دەڵێ: نەء پێی کافر نابێ، چونکە قسەی وا ئەقڵ نایگرێ، قسەیەکیش ئەقڵ نەیگرێ کەسی پێ بێبڕوا نابێ.

**٣٩- پێچەو مەجاز لە فەرموودەی هەواڵ‌و لە فەرموودەی بڕیاردا روودەدا:**

لەبەرئەوە گەرەکە شەرعزانەکان ئاگایەکی باشیان لەم مەسەلەیە بێ، هەر لەبەر ئەم جۆرە زانستە گرنگانەیە کەوان لەناو دەقەکانی قورئان‌و سوننەتدا. بەمەرج گیراوە کە کۆششکار (مجتهد) زمانی عەرەبی‌و زانستەکانی کە پەیوەندییان هەیە بە زمانی عەرەبییەوە بە باشی بزانێ، هەتا پەی بە چۆنێتی بوونی دەقەکان بە بەڵگە لەسەر بڕیارەکانی شەرع بەرێ. چونکە دەقەکان بەم زمانە گوتراون. لەڕاستیدا زۆر کەس لەم رۆژگارەدا لە فەتوا داندا هەڵەی گەورە گەورە دەکەن، چونکە شارەزا نین لە یاساو دەستوورەکانی زمانی عەرەبی، لە دەقەکان حاڵی نابن، مەجاز دەکەن بە حەقیقەت. حەقیقەت دەکەن بە مەجاز، جا لەخۆیانەوە حەڵاڵ حەرام دەکەن، شتی رەوا دەکەن بە پێویست، سوننەت دەکەن بە بیدعەت. خەڵك بەناحەق فاسق‌و کافر دەکەن، کە دەچیتەوە سەر بنج‌و بنەوانی بەڵگەکانیان دەبینی راستە کە ئەو بەڵگەو دەقانە هەن. بەڵام بەو مەعنایە نین کەئەوان بەهەڵە تێی گەیشتوون. باشترین نموونە بۆ ئەم مەسەلەیە: تەوقەکردنە لەگەڵ ئافرەتدا کە لەوشەی (مس)ی عەرەبی وەردەگیرێ. زاناکان لەم رووەوە دوو رایان هەیە. هەندێ دەفەرموون نادروستە، هەندێ تر دەفەرموون: دروستە. هەر لایەی بەڵگەی خۆی هەیە، بەڵگەکان ئەوەندە وردو ناسکن. بەهەموو کەس هەرس ناکرێن، کەواتە: پێویستە زانا تواناو داناو فرەزان بێ، هەتا بتوانێ لەنگەری کار رابگرێ، دەنا نەرێز بۆ خۆی مسۆگەر دەکا نە بایەخ بۆ رایەکەی. بەڵکوو بەدەستی خۆی پەردە لەسەر نەزانی خۆی لادەباو خۆی ریسوا دەکا.

فەرموودەیەکی صەحیحی بوخاری دەفەرموێ: "تا لە هاڵاوی دۆزەخە. لەبەرئەوە بەئاو فێنکی بکەنەوە!" کەچی دوژمنانی ئیسلام ئەمەیان کردووە بە

مەهانەیێ بۆ تانەدان لـە ئیـسلام، دەڵـێن: شـتی وا ئەفـسانەیە، هـاڵاوی دۆزەخـی چی؟ تا لەمیکرۆبی سەر زەوی پەیدادەبێ. بەڵام هەموو کەسێ دەزانـێ کـە ئـەم قسەیە خۆی درۆیە، بۆ خزمەتی حەق نەگوتراوە، چونکە هـەموو کـەس دەزانـێ کـە مەبەسـت لـەم فەرموودەیـە پێچەو مـەجازە. وەك ئـەوە ئێمـە لـەرۆژی زۆر گەرما لە قرچەی نیوەڕۆدا دەڵێین: ئەمڕۆ دەرگای دۆزەخ کرابۆوە.

**٤٠- بەڵام نابێ پێ لە تەئویلاتی مەجازی هەڵبڕین:**

حەزدەکـەم کـە ئـەم تێبینییـە رابگەیـەنم: تـەئویل کردنـی فـەرموودەو دەقەکانی بەگشتیو لادانیان لە ظاهیریان، بەڕاستی کارێکی پڕ مەترسییە، نابێ زانای خاوەن تەقوا پەنا بۆ شتی وا ببا، مەگەر مەهانەیەکی رەوای وەهای هـەبێ کە رێگەی ئەوەی پێ بدا. جا ئەو مەهانەیە ئەقڵی، یا نەقڵی بێ دەبێ.

وەکـی تـریش گـەڵێ تـەئویلی بـێ بەڵگـە قـەبووڵ نـاکرێن. وەك زۆر لـە تەئویلاتی باطینییەکان. کە نە دەقی فەرمایشتەکان ئـەو مـەعنا بـێ مەعنایانـە هەڵ دەگرن، نە سیاق، نە زەوقی سەلیم، هەر لەخۆیانەوە بۆ دژ وەستانی ئەهلی هەق بە بۆرە مەهانەیێ ئایەتو حەدیث بە ئارەزووی خۆیان تەئویل دەکەن.

لەم چەرخەیشدا کەسانی هاوچەرخ لەخۆیانـەوە بـە بـۆرە بۆنـەو هۆیـێ دەقـەکان لـە ظـاهیری خۆیـان لادەدەن، وەك هەنـدێ دەڵـێن: مەبەسـت لـەهاتنی مەسیح لەئاخر زەمانا هێمایە بۆ ئەوە کـە رۆژێ دەبـێ پەیامەکـەی مەسـیح کـە ئاشتیو بێ وەیییـە سـەردەکەوێو شـەڕو شـۆڕ نامێنـێ. گوایـە بەقـسەی ئەمانـە بەس مەسیح (سلاوی خودای لێ بێ) پێغەمبەری ئاشتی بووە.

ئەم تەئویلە کە ئەم نووسەرە دەیکا کـە لـەدوو سـەرەوە هەڵەیـە. یەکـەم: هاتنە خوارەوەی عیسای مەسـیح بۆسـەر رووی زەوی لـە سـوننەتدا موتەواتـەرە. جێگەی گومان نییە، پێویستی بەم تەئویلە لەڕوو لاوازو بـێ تامـە نییـە. دووەم:

ئەمە دەق داواکەی موبەششیرو موستەشریقەکانە: کە گوایە: ئیسلام ئایینی شیرو تیرەو مەسیحییەت بەس خۆی ئایینی ئاشتییە، داخەکەم ئەم قسە زەهراوییانە ئەوەندە گوتراونەتەوە لەدڵمانا چەسپیون. ئایا نابینی هەتا ئێستاش زۆر لە شێخو مەلاو حاجییەکانمان رێك وەك پیرێژنەکان دەڵێن: ئێمە قلێچ موسوڵمانین!

### ٤١- عالەمی غەیب جیایە لە عالەمی شەهادە (جیهانی لەبەرچاو):

وەك هەموومان دەزانین سوننەت قسە لەزۆر بابەت دەکا، کە یەکێ لەوانە (جیهانی نهێنییە: عالم الغیب) وەك باسی فریشتە، کە لەشکرێکن لە سوپاکانی خودای گەورە. وەك جنۆکەو شەیاتینو پەریو دێوو درنج، وەك باسی تەختو بارەگای خوداو، باسی کورسیو لەوحو قەڵەم، وەك باسی ژیانی بەرزەخ، پرسیاری ناو گۆڕو سزای ناو گۆڕ، گۆڕ باخێکە لە باخەکانی بەهەشت بۆ پیاو چاکانو خواناسان باسی ژیانی ناو بەهەشتو دۆزەخ. باسی زیندوو بوونەوە، حەشرو مەیدانی مەحشەرو مەینەتیو سەخڵەتییەکانی رۆژی قیامەتو تکاکارییە گەورەکەی پێغەمبەرو باسی تەرازووی کێشانی کردارو لێپرسینەوەو پردی سیراتو نامەی کردارو بەهەشتو دۆزەخو جۆرەها خۆشیو ناخۆشی گیانیو جەستەیی لەو دونیاو، باسی پایە بەرزەکانی ناو بەهەشتو زیندانە ناخۆشەکانی ناو دۆزەخ. کە زوربەی ئەم بابەتانە لە قورئانیشدا ئاماژەیان بۆ کراوە. بەڵام وەك سوننەت بە پاراوی روون نەکراونەتەوە.

جا ئەرکی سەرەکی سەرشانی موسوڵمانی ساخ، لەبارەی ئەم جۆرە بابەتانەوە، کەوان لەناو قورئانو سوننەتی راستو دروستدا. ئەوەیە کە بەبێ سێو دوو و چەنو چوون، بەپێی ئەو یاسا ساغانەی کە زانا گەورەکان دیارییان کردوون، باوەڕی پێیان هەبێ، هەروەك پێشینانە باشەکان باوەڕیان پێیان

هەبووەو تەسلیمی هەواڵەکانی خوداو پێغەمبەر بوونو زۆر لە کارەکەیان نەکۆڵیوەتەوە ﴿وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا – البقرة/٢٨٥﴾.

وە بەهیچ جۆرێ دروست نییە بەر پەرچ بدرێنەوە. بە ماهانەی ئەوەوە گوایە: شتی وا نەبیستراوەو نەبینراوەو رووی نەداوەو ئێمە بەشتی واوە دانەهاتووین. کەواتە: شتی وا ناسەلمێنین، بگرە دروست نییە بڕەوو ڕەواج بە قسەی ئەم کۆمەڵو دەستانە بدرێ کە بەبڕو بیانوو باوەڕیان بەم بابەتە گرنگانە نییە، کەوان لەناو سوننەتی ساخی پێغەمبەردا، وەك موعتەزیلەو رافزیو باطینییەکان. بەبێ گومان مەدرەسەی عەقلانی کەلام، کە ئەو مەدرەسەیەیە کە بەپێی پەسەندکردنی هۆشو بەس. باوەڕ بە بابەتەکانی بیروباوەڕەکان دەکەن، ئەگەر دەرکی ئەم رێڕەوە پیرۆزەیان بکردایە: کە پێشینانە باشەکان گرتوویانە، کە ئەم ئایەتە پیرۆزەیان کردووە بە دروشم، بۆ باوەڕکردن بەهەموو هەواڵێکی غەیبو جیهانی نهێنی ﴿وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا – البقرة/٢٨٥﴾ قەت تووشی ئەو هەمکە هەڵە گەورانە نەدەبوون، کە ئەو هەمکە حەدیثە صەحیحانە ئایەخ بکەنو بڕیاری مەزهەبی خۆیان تەفضیل بدەن بەسەر دەقی رۆشنی ئایەتو حەدیثدا. چونکە ئەوان هەر ئایەتێ لەگەڵ مەشرەبە چەوتەکەی خۆیان نەسازێ، بە کەیفی خۆیان تەئویلی چەوتو چەوێڵی دەکەنو مەعناو مەبەستەکەی دەگۆڕن، وەك ئەم ئایەتانە: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ، إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ – القيامة/٢٢-٢٣﴾. هەندێکیش دەڵێن: ئێمە باوەڕمان بەهیچ حەدیسێ نییە. کە نەگاتە رادەی تەواوتور لەبەرئەوە بە ئیعتیماد لەسەر ئەو ئایەتە ئارەق بە حەلاڵ دەزانین: ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا – المائدة/٩٣﴾.

**٤٢- نابێ مەبەست لە گوتەو بێژەو ڕستەکانی قورئانو حەدیث بەپێی گۆڕانی واتای وشەو پەیدابوونی زاراوەی نوێ، کە بەرە بەرە پەیدا دەبن، لێك بدرێنەوە:**

چونکە وشەو مەعنای وشە، چەرخ لەپاش چەرخ، گۆڕانی بەسەردا دێ، گەلێ وشە بەپێی کات، بەپێی شوێن، بەپێی زمان مەعنای جیایە، گەرچی لە بنەڕەتدا ئەو وشەیە یەك مەعنای بووە، لەبەرئەوە پێویستە بۆ تێگەیشتن لە مەعنای بێژەکانی قورئانو سوننەت، دەبێ بگەڕێینەوە بۆسەر مەعناکانیان کە لەکاتی گوتنی وشەکاندا لێیان فەهمراونەتەوە. ئیمامی غەزالی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: "سەرچاوەی تێکەڵو پێکەڵبوونی زانستە ناپەسەندەکان بە زانستە شەرعییەکانەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆڕانکاریو تەحریفەی کە لەناوە پەسەندەکاندا کراوە، کە بەرە بەرە مەبەستو مانای ئەو ناوانە وەك مەبەستو مەعنای سەردەمی سەحابەو تابعین نەماون بەتایبەتی ئەم پێنج بێژەیە: فیقە، عیلم، تەوحید، تەذکیر، حیکمە".

هەزار ڕەحمەت لەگۆڕت غەزالی، ئەم کێشەیەی کەتۆ دەستنیشانت کردووە، لەم چەند بێژە کەمانەدا، ئێستە بووە بە مۆدەی سەردەم، سەفینەی فەضا. چەنێ پەیوەندیی بە سەفینەی صەحراوە، کە حوشترە ماوە، زوربەی وشەیش لەم چەرخەدا ئەوەندە پەیوەندیی ماوە بە مەعنای ئەو وشەیەوە لە سەردەمی پەیدابوونیدا. بۆ نموونە دەڵێین: (صورة) لە زاراوی شەرعاو (صورەو تصویرو مصور) لە زاراوی ئەمڕۆدا هەر خودایان یەکە. کەچی لەم گۆشە نیگایەوە تێکەڵو پێکەڵ کراونو بەهەڵە مەعنا کراون.

**والحمدلله اولا واخرا**

**نوری فارس حەمە خان حەسەن**

**خادم العلماء والمشایخ والفقراء**

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

## پێرستی سەرباسەكان ﴿بەرگی یەكەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی یەکەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان «بەرگی دووەم»

# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾




# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾



# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی دووەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾





# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾




## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾




## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی سێیەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی چوارەم﴾

## پێڕستی سەرباسەكان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾




## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی پێنجەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

# پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

## پێرستی سەرباسەكان ﴿بەرگی شەشەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

## پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی شەشەم﴾

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| (٣) باب فضلِ بناء المَساجدِ<br>باسی خێری دروستکردنی مزگەوت | ٥٣٤ |
| (٥) باب تحريم الرِبا (سووخۆری نادروستە) | ٥٣٥ |
| (٦) بابُ حِفظ اللِسَان<br>پاراستنی زمان لە قسەی خراپ | ٥٣٥ |
| (٧) باب عقوبة مَنْ يأمر بالمعروف ولاَ يفعله، وَيَنهَى عَنِ المنكر وَيَفعله<br>سزای سەختی ئەوانەی کە فەرمان دەکەن بە چاکەو خۆیان نایکەن، هەروا<br>سزای سەختی ئەوانەی نەهی دەکەن لە خراپەو خۆیان خراپە دەکەن | ٥٣٧ |
| (٨) باب النَّهيِ عَنْ هتكِ الإنسانِ سترَ نَفْسِهِ<br>پێشگیریی لە هەڵماڵینی پەردەی خودا لەسەر بەندە خۆی | ٥٣٨ |
| (٩) باب تشميت العَاطِسِ وَكَرَاهةِ التثاؤبِ<br>نزای باش بۆ پژمیو سوننەتە، باوێشکدان نا پەسەندە | ٥٤٠ |
| (١١) باب فِي الفَأرِ وَأنّهُ مُسِخَ<br>باسی مشكو کەسانێ کە خودا کردوونی بە مشك | ٥٤٢ |
| (١٢) باب لا يُلدَغُ المُؤمِنُ مِنْ جُحْرٍ مَرَّتَيْنِ<br>موسوڵمان دەبێ زرنگو وریا بێ، لە یەك کونەوە دووجار شت پێوەی نەدات | ٥٤٣ |
| (١٤) باب النَّهي عَنِ المَدحِ إذا كَانَ فِيهِ إفراط وَخِيفَ مِنهُ فِتنَةُ المدوحِ<br>پێشگیری لە وەسپو مەدح، ئەگەر پێی لێ هەڵبڕێو مەترسی لێ بکرێ کە<br>مەدحکراوەکە پێی بایی ببێو کەیفی پێی بێ | ٥٤٥ |
| (١٥) باب مُنَاوَلةُ الأكبرِ<br>شت لە پێشدا دەدرێتە دەست کەسی بە تەمەنتر | ٥٤٧ |
| (١٦) باب التثبت فِي الحديث وحكم كتابة العلم<br>چوونە بنجو بنەوانی قسەو باسوخواسو بڕیاری نووسینی زانین | ٥٤٩ |

## پێڕستی سەرباسەكان ﴿بەرگی شەشەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی حەوتەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی حەوتەم﴾

# پێڕستی سەرباسەکان ﴿بەرگی حەوتەم﴾

## پێرستی سەرباسەکان ﴿بەرگی حەوتەم﴾